# خەرمانێک لە




# پرسیار ....

## دەربارەی

١ ـ قورئانی پیرۆز
٢ ـ ژیانی پێغەمبەران
٣ ـ ژیانی پێغەمبەر
٤ ـ رەمەزانی پیرۆز
٥ ـ جێنشینەکانی پێغەمبەر
٦ ـ هاوەڵانی پێغەمبەر
٧ ـ رۆژی قیامەت
٨ ـ زانایانی ئیسلام
٩ ـ مێژووی ئیسلامی
١٠ ـ ئافرەتانی ناودار
١١ ـ رۆشنبیری گشتی
١٢ ـ کورد و کوردستان

ئامادەکردنی : عبدالرحمن نجم الدین طه

# دەستپێک

**خوێنەری بەڕێز //**

ئەم نامیلکەی لەبەردەستت دایە بەرهەمی ڕەنج و ماندووبوونێکی زۆرە و خوێندنەوەی چەندین کتێب و پەڕاوی جۆراو جۆرم بۆ کردووە تا بتوانم خەرمانێکی ئەوتۆ پێشکەش بە خوێنەران و کتێبخانەی ئیسلامی بکەم .

بەو ئومێدەی بە ( خەرمان ) توانیبێتم ملۆیەک زیاتر بخەمە سەر ملۆیزانست و ڕۆشنبیریتان .

ئەم بەرهەمە بەر لەوەی بێتە خزمەتتان بژارێکی پوختی پرسیار و وەڵامەکانی کراوە ، لەڕوی سەرچاوەکانەوە سود لەو سەرچاوانە وەرگیراوە کە جێگەی باوەڕ و متمانەن

لەوانەیە لە هەندێ جێگەدا هەڵەی چاپ ڕوی دابێت ، یان دوبارە بونەوە هەبێت ، بۆیە داوای لێبوردن ئەکەم ، دیارە هەمومان مرۆڤین و مرۆڤیش لە هەڵەوە نزیکە ، لەگەڵ ئومێدی نزای خێرتان .

خەرمانێك لە ----* ---- (١٠٠٠) پرسیار




# ٧٥ پرسیار
# دەربارەی قورئانی پیرۆز

# خەرمانێك لە ———❀——— ( ١٠٠٠ ) پرسیار

پ١/ لە سەرەتای سورەتێكدا ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾ نیە ، لە سورەتێكی تردا دوو ﴿ بسم الله ... ﴾ ی تیایە ، ئەو دوو سورەتە ناویان چیە ؟

و // سورەتی ( التوبة ) یا ( البراءة ) ﴿ بسم الله .. ﴾ تیا نیە ، لە سورەتی ( النمل ) یشدا دوو ﴿ بسم الله .. ﴾ هەیە .

پ٢/ كام سورەت لە گشت ئایەتەكانیدا ناوی پیرۆزی ( الله ) هەیە ؟ .

و// سورەتی ﴿ المجادلة ﴾ .

پ٣/ چەند پێغەمبەر لە قورئانی پیرۆزدا ناویان هاتووە ؟

و// بیست و پێنج پێغەمبەر .

پ٤/ دوو ئایەت لە قورئانوا لە هەردوو سەرەوە دەخوێنرێنەوە ، كامانەن

و// یەكەم : ﴿ ربك فكبر ﴾ مدثر ٣ ، دووەم : ﴿ كل في فلك ﴾ الانبياء ٣٣

پ٥/ ئەو كتێبە ئاسمانیانەی لە قورئاندا ناویان هاتووە ، كامانەن ؟

و// ﴿ القران ، التوراة ،الزبور ،الانجيل ، صحف ابراهيم ﴾ .

پ٦/ ئایەتی ﴿ ويطعمون الطعام على حبه مسكينا ويتيما واسيرا ..... الاية ﴾ لە بارەی كێ وە هاتوەتە خوارەوە ؟ .

و// علی كوڕی ابو طالب و فاطمەی خێزانی - خوایان لێ ڕازی بێت . .

پ٧/وشەی ﴿ الساعة ﴾ لە قورئاندا بە مانای چی هاتووە ؟

و// بە دوو مانا ١- ڕۆژی قیامەت ، ٢- كاتێكی كەم لە زەمان .

پ٨/ چ سورەتێك دوو سوجدەی ( تیلاوة ) ی تیایە ؟

و// بە پێی ڕای ئیمامی شافیعی : سورەتی ( الحج ) ئایەتی (١٨ـ ٧٧ )

پ٩/ بە پێی ڕادەی هێواشی و پەلەیی لە خوێندنەوەدا ، چەند جۆر خوێندنەوەی قورئان هەیە ؟

و// سێ جۆر : ( الـترتیل ) لەسـەر خۆ ، ( التدویـر ) مـام نـاوەندی ، ( التحدیر ) بەپەلە .

پ١٠/ ئەو مزگەوتانەی لە قورئانی پیرۆزدا ناویان هاتووە کامانەن ؟

و // ﴿ المسجد الحرام ، المسجد القصى ، المسجد الضرار ﴾

پ١١ / ئـەو سـورەتە کامەیـە گشـت ئایەتـەکانی بـە پیتـی ( س ) کۆتایی هاتووە ؟

و// سورەتی ( الناس ) .

پ١٢ / چەند جار ناوی پیرۆزی (محمد ) لە قورئاندا هاتووە ؟

و// چوار جار

پ١٣/ سورەتی ( بنی النضیر ) کام سورەتیە ؟

و// سورەتی ( الحشر ) ٥ .

پ١٤/ درێژترین ئایەتی قورئان کامەیە ؟

و// ئایـەتی (٢٨٢) سـورەتی ( البقـرة ) . . ﴿ یاایـها الذیـن امنـوا إذا تداینتم بدین ... الایة ﴾

پ١٥/ درێژترین سورتی قورئان و کورترین سورەتی کامانەن ؟ .

و// درێژترین سورت ( البقرة ) و کورت ترین سورەت ( الکوثر ) ٥.

پ١٦ / قورئـانی پـیرۆز بـە چـەند قۆنـاغێك هاتوەتـە خـوارەوە ، ئـەو قۆناغانە کامانەن ؟

و// بە سێ قۆناغ هاتوەتە خوارەوە : ١- ( هاتنەخوارەوە بۆ لوح المحفوظ ) ٢- لە ( لوح المحفوظ ) ەوە بۆ ( بیت العزة ) لە ئاسمانی دونیادا . ٣- لە ( بیت العزة ) ەوە بۆ پێغەمبەر( ﷺ).

پ١٧/ ناوی كام لە ڕۆژەكانی هەفتە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە ؟ .

و// الجمعة و السبت .

پ١٨/ یەكەم سورەت كە لە شاری ( مەدینە ) هاتوەتە خوارەوە كامەیە ؟

و// سورەتی ( البقرة ) یە .

پ١٩/ هاوەڵێكی پێغەمبەر ( ﷺ) لە قورئاندا ناوی هاتوە ، ئەو هاوەڵە بەرێزە كێ یە ؟ .

و// ( زیدی كوڕی حارث ) ـیە

پ٢٠ / وشەی ( كلا ) لە چەند جوزئی قورئاندا هاتووە ؟

و// تەنها لە پانزە جوزئی دوایی دا ، واتە لە جوزئی ( ١٦ تا ٢٠ ) .

پ٢١/ كام سورەت لە دوای سورەتی ( الفاتحة ) ەوە هاتوەتە خوارەوە ؟

و// سورەتی ( المسد ) .

پ٢٢/ درێژترین وشە لە قورئانی پیرۆزدا كامەیە ؟

و// وشەی ﴿ فأسقيناكموه ﴾ لە سورەتی ( الحجر ٢٢ ) .

پ٢٣/ كام سورەت گشت ئایەتەكانی بە پیتی ( ر ) كۆتایی هاتووە ؟ .

و// سورەتی ﴿ القمر ، القدر ، العصر ، الكوثر ﴾ .

پ٢٤/ كام خەلیفەی ڕاشیدە بوو بۆ یەكەمین جار قورئانی پیرۆزی كۆ كردەوە ؟ .

و// ئەبو بەكری صدیق ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٢٥/ ئەو سورەتانەی بە ( قل ) دەست پێ دەكەن ناویان چیە ؟ .

و// ﴿ الجن ، الكافرون ، الاخلاص ، الفلق ، الناس ﴾

پ٢٦/ چەند سوجدەی تیلاوە لە سەرجەم قورئانی پیرۆزدا هەیە ؟ .

و// بەڕای ئیمامی شافیعی و حەمبەل ( ١٤) سوجدەیە .

پ٢٧/ مەبەست لە وشەی ﴿ الثقلین ﴾ لە سورەتی ﴿ الرحمن ﴾ دا چیە ؟

و// مەبەست لە ئادەمیزاد و جنۆكەیە .

پ٢٨/ یەكەم ئایەتی قورئانی پیرۆز و دوا ئایەت كە هاتونەتە خوارەوە كامانەن ؟ .

و// بە پێی ڕاسترین ڕا یەكەم ئایەت ﴿ اقرا بسم ربك الذی خلق) . تا(مالم یعلم ) العلق ١ ـ٥ ، دوا ئایەتیش ﴿ الیوم اكملت لكم دینكم .. تا دەگاتە ...الاسلام دینا ﴾ مائدە ٣

٢٩/ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە پێی زانستی چاك خوێندنەوە ( تجوید ) حوكمی چۆنە ؟ .

و// فەرزی عەینە واتە هەركەس بە ( تجوید ) دەوە قورئان نەخوێنێت گوناهبار دەبێت .

پ٣٠/ كێ ئایەت و سورەتەكانی قورئانی بەم شێوەی كە ئێستا هەیە تەرتیب كردوە ؟ .

و// خودی پێغەمبەری خوا (ﷺ)

پ٣١/ گەورەترین ژمارە كە لە قورئاندا هاتووە ، چەندە ؟

فەرمانێك لە ــــــ ❀ ــــ (١٠٠٠) پرسیار

و// سەد هەزارە .. ﴿ وارسلناه الى مائة الف او يزيدون ﴾ صافات ١٤٧.

پ٣٢/ کێ بۆ یەکەمین جار نوقتەی بۆ پیتەکانی قورئان دانا ؟ .

و // بە شێوەی تاکە کەسی : ( ابـو اسـود الـدولی ) بووە ، بە شێوەی ڕەسمیش بە فەرمانی خەلیفە ( عبد الملك کوڕی مەروان ) و سەرپەرشتی ( حجاج ) ئەنجام درا

پ٣٣/ لە قورئانی پیرۆزدا چەند سوجدەی شوکر هەیە ؟ .

و// بەڕای ئیمامی شافیعی ( ١) سوجدەیە و وە سورەتی (ص) /٢٤/

پ٣٤/ کام ئایەت ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە خۆر وەستاو نیە ؟ .

و// ئایەتی ﴿ والشمس تجری لمستقر لها ... ﴾ یس ٣٨ .

پ٣٥/ مەبەست لە ﴿ مغضوب علیهم و لا الضالین ﴾ لە سورەتی ( فاتحة ) دا کێ یە ؟ .

و// مغضوب علیهم : جولەکەکان ، الضالین: دیانەکانن

پ٣٦ / سورەتێك لە قورئاندا ناوی یەکێك لە پێنج پایەکانی ئیسلامی لێ نراوە ، کامەیە ؟ .

و// سورەتی ( حج ) ٥ .

پ٣٧/ قورئان بە چەند شێوازێك ( تَحَدّی ) دەکات کە کەس بتوانێت وەکو قورئان دابنێ و ، ئەو شێوازانە چین ؟ .

و// سێ شێوازن : ١- ﴿ بمثل هذا القرآن ﴾ ٢- ﴿ بعشر سور مثله ﴾ ٣-﴿ بسورة من مثله ﴾ .

پ٣٨/ لە ئایەتێکدا ( ٦ صەد ) زۆر لە نزیك یەکەوە هاتوون ئایەتەکە کامەیە ؟

و// ﴿ مذبذبين بين ذلك لا إلى هؤلاء ولا إلى هؤلاء ﴾ .

پ٣٩/ سورەتی ( عبس ) لە بارەی دڵشکاری هاوەڵێکی پێغەمبەرەوە هاتوەتە خوارەوە ، ئەو هاوەڵە ناوی چیە ؟

و // حەزرەتی ( عبد الله کوڕی أم مکتوم ) خوای لێ ڕازی بێت .

پ٤٠ / گەورەترین جیاوازی لە نێوان ( قورئان و حەدیسی قودسی ) دا چی یە ؟

و// دەق و ماناى قورئان ، هەردووکی لە لایەن خواوەیە ، بەڵام حەدیسی قودسی : تەنها ماناکەی لە لایەن خواوەیە و دەقەکەی هی پێغەمبەرە .

پ٤١/ یەکێك لە سورەتەکانی قورئان بە ناوی ئافرەتێکەوە ناونراوە ، کام سورەتەیە ؟

و// سورەتی ( مریم ) ه .

پ٤٢/سوننەتە لە وەڵامی ﴿ أليس الله بأحكم الحاكمين ﴾ دا بڵێی چی ؟

و// سوننەتە بڵێی : ﴿ بلى وانا على ذلك من الشاهدين ﴾

پ٤٣/ ئەو ئایەتە پیرۆزە کامەیە کە هەر (٢٨) پیتە هیجاییەکانی زمانی عەرەبی تیادایە ؟ .

و// ئایەتی ﴿ محمد رسول الله والذين معه اشداء على الكفار رحماء بينهم .... الاية ﴾ الفتح ٢٩

پ٤٤/ کام سورەت لە پێش سورەتی ( الفاتحة) دا هاتوەتە خوارەوە ؟

و// سورەتی ( المدثر ) .

پ٤٥/ قورئانی پیرۆز چەند سورەتە و ، بە ماوەی چەند ساڵ هاتوەتە خوارەوە ؟ .

و// ( ١١٤ ) سورەتە و بە پێی ڕاسترین ڕا : بە (٢٣) ساڵ هاتوەتە خوارەوە .

پ٤٦/ عومەری كوڕی خطاب ( ﷺ ) ع سورەتێكی خوێندەوەو موسڵمان بوو ؟ .

و// سەرەتای سورەتی ( طه )

پ٤٧/ كێیە لە قورئاندا خوای گەورە خۆی ناوی ناوە ؟ .

و// حەزرەتی ( یەحیا ) .

پ٤٨/ سەرەتای سورەتی ( البقرة ) باسی سێ تاقم دەكات ، ئەو تاقمانە كێن ؟ .

و// ١- ئیمانداران ٢- بێ باوەڕان ٣- دوو ڕووەكان .

پ٤٩/ كراسەكەی (یوسف ) سێ جار ڕۆڵی شایەتی بینیوە ، باسیان بكە

و// ١- شایەتی درۆ : گورگ خواردنی یوسف . ٢- دڕانی لە پشتەوە : شایەتی لەسەر داوێن پاكی یوسف . ٣- شایەتی لەسەر مانی یوسف بۆ باوكی و چاك بونەوەی چاوی باوكی بە ( فەرمانی خوا ) .

پ٥٠/ ئەو قورئانەی ئەبوبەكری صدیق ( خوای لێ ڕازی بێت ) كۆی كردەوە ، دوای خۆی لای كێ هەڵگیرا ؟

## خەرمانێك لە ـــــ۞ـــــ (١٠٠٠) پرسیار

و// دوای خۆی لای حەزرەتی عومەر بوو، پاشان لای دایکی موسڵمانان ( حفصه) ئینجا لای حەزرەتی ( عوسمان ) .

٥١/ چ ئایەتێك ئاماژە دەكات بۆ بەردەوام فراوان بونی گەردوون ؟ .

و// ﴿ والسماء بنيناها بأيد وإنا لموسعون ﴾ .

پ٥٢/ ناوی زاتی چەند فریشتەیەك لە قورئاندا هاتووە كامانەن ؟ .

و// جبریل : فریشتەی نیگا ، میكال : فریشتەی ڕۆزی ، مالك : سەرۆكی پاسەوانانی دۆزەخ .

پ٥٣/ ( آية الكرسي ) كام ئایەتەیە ؟

و// ئایەتی (٢٥٥-البقرة) یە﴿ الله لا إله إلا هو الحي القيوم ... الآية ﴾

پ٥٤ / ئایە تێك سێ جار لە سورە تی ( المائدة ) دا هاتووە هەر جارە بە كۆتاییەكەوە . ئەو ئایەتە كامەیە

و / ئایەتی : ﴿ ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون ﴾ / الظالمون / الفاسقون .

پ٥٥ / ئەوە كێیە كە بەساوایی قسەی كردووە ، لە قورئاندا ناوی هاتووە ؟

و // حەزرەتی عیسی ( عليه السلام ) .

پ٥٦ / ئەو سورەتە كامەیە لە دوای سورەتی ( الناس ) هاتوەتە خوارەوە ؟

و// سورەتی (الاخلاص).

پ٥٧/ كام ئایەتە زۆرترین جار لە قورئاندا دووبارە بوەتەوە ؟

و// نا یەتی ﴿ فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ ( ٣١ جار) هاتووە .

پ٥٨ / شەوانە ، كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەچووە سەر جێگای خەو ، سێ سورەتی دەخوێندەوە و فوی دەكرد بە دەستی دا و ئنجا دەستی دەهێنا بەسەر هەموو لاشەیدا و ئەو كارەی (٣جار ) دەكرد .. ئەو سورەتانە كامانەن ؟

و// سورەتی : الاخلاص/ الفلق / الناس .

پ٥٩// چەند سورەتێك بە ناوی پێغەمبەرانەوە ناونراون.. كامانەن ؟

و// سورەتی : یونس / هود / یوسف / ابراهیم / محمد / نوح .

پ٦٠// سورەتەكانی قورئان بە پێی درێژیان دەكرێن بە چەند بەشەوە ئەوبەشانە ناویان چی یە؟

و//چوار بەش( الطوال ): كە حەوت سورەتە درێژە كەی سەرەتای قورانە. ( المئون ): ئەوسورەتانەیە كەسەد ئایەت یان تۆزێ زیاترن. ( المثاني ): ئەوسورەتانەیە كەلەسەد ئایەت كەمترن.(المفصل):سورەتەكانی كوتاییقورئانە لە ( الحجرات ) تا ( الناس).

پ٦١/ خوێندنی كام سورەت بەرامبەر ١/٣ یقورانە؟

و//سورەتی( الاخلاص ) .

پ٦٢/پێغەمبەر(ﷺ ) فەرمویەتی،چەند سورەتێ پیری كردم،ئەوسورەتانەكامانەن؟

و//پێنج سورەتی پیرێنن: هود/ الواقعة/ المرسلات/ النبا/ التكویر/

پ٦٣/ئەو پیتە پچڕ پچڕانەی کە لە سەرەتای هەندێك لە سورەتەکانی قورئاندا هەن ، چەندن وکامانەن؟

و//ژمارەیان چواردە پیتە وەکۆنەبنەوەوە لە رستەی(نص حكيم قاطع له سر )

پ٦٤/ ناوی کام لە هۆزەکانی عەرەب لە قورئاندا هاتووە؟

و// هۆزی قورەیش لە سورەتی ( قريش ) دا.

پ٦٥// کام سورەت هەموو ئایەتەکانی بە پیتی( ل ) کۆتاییان هاتووە؟

و//سورەتی ( الفيل ).

پ٦٦/ قورئانی پیرۆز چەند ئایەت و چەند وشە وچەند پیتە؟

و//(٦٢٣٦) ئایەتە ، (٧٩) هەزار ووشەیە، (٣٢٣٦٧٠) پیتە.

پ٦٧/ وشەی ( الجنة) و وشەی ( النار ) چەند جار لە قورئاندا هەن؟

و// (الجنة) ٦٦جار، ( النار ) ١٢٦ جار .

پ٦٨/ کام سورەت ناوی سورەتی ( الساهرة ) و ( الطامة ) شی لێ نراوە

و// سورەتی ( النازعات ) .

پ٦٩/ لە قورئانی پیرۆزدا باسی چەند خەونێك دەکات کە بەڕاستی هاتونەتە دی ، ئەو خەوانە چین ؟

و// خەونی ( عەزیز ) ی میسر بە مانگا و گرانیەوە ، خەونی ( یوسف ) بە خۆر و مانگ و ( ١١) ئەستێرەو کڕنوش بردنیان ، خەونی هاو زیندانیەکانی ( یوسف ) بە چارەنوسی خۆیانەوە ، خەونی پێغەمبەرمان (ﷺ) بە چونە ناو مەکەوە .

پ٧٠/ ئەو پێغەمبەرە کێ یە کە لە قورئاندا بەناوی ( ذا النـون ) و ( صاحب الحوت ) ناو براوە ؟

و// یونس پێغەمبەر ( سەلامی خوای لێ بێت ) .

پ٧١/ ئەوسورەتە کامەیە کە لە دوا ئایەتیدا ناوی دوو پێغەمبەر هاتوە؟

و// سورەتی ( الاعلی ) .

پ٧٢/ ئەو سورەتە کامەیە بە ناوی میوەیەکەوە ناو نراوە ؟

و// سورەتی ( التین ) ە .

پ٧٣/ ئەو ئایەتە کامەیە کە لەناو ( کەعبە ) دا هاتوەتە خوارەوە ؟

و// ئایەتی ﴿ ان الله یامرکم ان تؤدوا الامانات الی اهلها .... ﴾ النساء٥٨

پ٧٤/ ئەو سورەتەی ناوی ( بوکی قورئان ) ی لێ نراوە ، کام سورەتەیە ؟

و// سورەتی ( الرحمن ) ە .

پ٧٥/ ئـەو سـورەتە کامەیـە گشـت ئایەتـەکانی بـە پیتـی ( د ) کۆتایی هاتووە؟ .

و// سورەتی ( الاخلاص ) ە .

هەرمانێك لە ــــــ۞ــــــ (١٠٠٠) پرسیار

# ٦٠ پرسیار دەربارەی ژیانی پێغەمبەری مەزن



## خەرمانێك لە ــــــ❀ــــــ (١٠٠٠) پرسیار

پ١/ هاشمی باپیرە گەورەی پێغەمبەر دوو ئیشی گەورەی لە ئەستۆ دابوو ، ئەو ئیشانە چی بوون ؟

و// یەکەم / ( الرفادة) نان دان بە حاجیەکان . ، دووەم / ( السقایة ) ئاو دان بە حاجیەکان .

پ٢/ کێ سەرلە نوێ بیری ( زەمزەم ) ی دۆزیەوەو هەڵیدایەوە ؟

و// ( عبد المطلب ) ی باپیری پێغەمبەر (ﷺ) .

پ٣/ بۆچی پێغەمبەر ( ﷺ) فەرمویەتی : ( من کوڕی دوو کەسە سەربڕاوەکەم ) ؟

و// چونکە لە نەوەی حەزرەتی ئیسماعیل پێغەمبەرەو ، کوڕی ( عبد الله) یە ، کە هەردووکیان کراون بە قوربانی ، بەڵام لە ئەنجامدا لەبری ئیسماعیل بەرانێك و لەبری ( عبدالله) سەد حوشتر کرا بە قوربانی .

پ٤/ ئەو کەسە کێ بوو کە پەنای پێغەمبەری خوای دا ، پاش گەڕانەوەو نائومێد بوون لە خەڵکی طائف .

و// ( موتعەمی کوڕی عودەی ) .

پ٥/ یەکەم مزگەوت کە لە مەدینەدا دروست کرا ڕوەو کوێ بوو ؟

و// ڕوەو ( بیت المقدس ) بوو لە ( فلسطین ) .

پ٦/ ناوی پێنج پشتی پێغەمبەری ( ﷺ ) ئازیز بڵێ .

و// محمد کوڕی عبد المطلب ، کوڕی هاشم ،کوڕی عبد المناف ، کوڕی قصی .

پ٧/ عبد المطلب ی باپیری پێغەمبەر ( ﷺ ) چەند کوڕی هەبوو ؟

و/ ( نه ) کوڕی نه‌بوو .

پ٨/ له جەنگی ( بەدری گەورە) دا ، چەند کەس لە بێ باوەڕان کوژران ، ناوی دوان لە سەرانیان چی بوو ؟

و/ ( ٧٠ ) کەسیان لێ کوژرا ، ئەبو جەهل ، ئومەیەی کوڕی خەلەف .

پ٩/ ئەو شەوەی پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە کێ لە شوێنەکەیدا خەوت ؟

و/ حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (خوای لێ ڕازی بێت ).

پ١٠/ ئەو سێ کەسە ئیماندارەی لە جەنگی ( تبوك ) دا خۆیان دواخست کێ بوون ؟

و/ کەعبی کوڕی مالیك ، مەرارەی کوڕی ڕەبیع ، هیلالی کوڕی ئومەیە ، ( خوایان لێ ڕازی بێت ) .

پ١١/یەکەمین ئافرەت لە سەردەمی پێغەمبەردا ( ﷺ ) شەهید بوو کێ بوو ؟

و/ خاتو سومەیە ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ١٢/ دەورو بەرو ناوی کەعبەی پیرۆز چەند بتی تیادا بوو ؟

و/ ( سێ سەد و شەست بت ) .

پ١٣/ لە جەنگی ( تەبوك ) دا ژمارەی لەشکری موسولمانان چەند بوو ؟

و/ ( ٣٠) هەزار کەس بوون .

پ١٤/ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) لەکام مانگدا لەدایك بوو ، وە لە کام مانگدا وەفاتی کرد ؟



## خەرمانێك لە ـــــ۞ــــ (١٠٠٠) پرسیار

و// لە مانگی ( ربیع الاول ) دا لە دایك بووە ، هەروەها لە مانگی ( ربیع الاول ) یشدا وەفاتی كردووە .

پ١٥/ پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) چەند ڕۆژ نەخۆش بوو ، وە لە چ كاتێكدا وەفاتی كرد ؟

و// چواردە ڕۆژ نەخۆش بوو ، لە چێشتەنگاوێكی درەنگی ڕۆژی دووشەممە دا وەفاتی كرد

پ١٦/ مۆری پێغەمبەرایەتی ( ﷺ ) لە كوێی لاشەی پیرۆزی پێغەمبەردا هەبوو ؟

و// لە نێو شانی پیرۆزیدا ، هێندەی هێلكە كۆترێك بووە .

پ١٧/ هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەر ( ﷺ ) سەرەتا بە چی دەستی پێكرد ؟

و// بە بینینی خەوی ڕاست ، هەر خەوێكی بدیایە ڕێك دەهاتە دی .

پ١٨/ قۆناغی ( بانگەوازی نهێنی ) لە مەكەدا چەندی خایاند ؟

و// ماوەی ( ٣ ) ساڵ بەردەوام بوو

پ١٩/ بۆچی پێغەمبەر ( ﷺ ) ساڵی ( ١٠ ) یەمی كۆچی ناو نا ( ساڵی ماتەمینی ) ؟

و// چونكە خاتوو خەدیجەی خێزانی و ( ئەبو تالیبی مامی ) لەو ساڵەدا كۆچی دواییان كرد .

پ٢٠/ گەمارۆی هەمەلایەنە لە كێوی ( ئەبو تالیب ) دا چەند ساڵی خایاند ؟

و// سێ سالی ڕەبەق ، لە مانگی ( محرم ) ی سالی (٧ ) تا مانگی ( محرم ) ی سالی ( ١٠ ) ی كۆچی

پ٢١/ لە بەیعەی ( عقبـة ) ی دووەم دا پێغەمبەر ( ﷺ ) چەند كەسی هەلبژارد و چ ناوێكی لێنان ؟

و// دوانزە كەس ، ناوی نان ( نقیب )

پ٢٢/لە كاتی كۆچ بۆ مەدینە پێغەمبەر ( ﷺ ) لەگەل ئەبوبەكر دا چوونە ناو كام ئەشكەوت و چەندە تیایدا مانەوە ؟

و// ئەشكەوتی ( ثور ) سێ شەو تیایدا مانەوە

پ٢٣/ ئەو قسە مەشهورەی ( ئەبوتالیب ) بە ئەبرەهەی وت چی بوو ؟

و// ( ان للبیت ربا سیحمیه ) واتە : كەعبە خواو خاوەنی خۆی هەیە و ئەو ئەیپارێزێت .

پ٢٤/ یەكەم مزگەوت كە پێغەمبەری ئازیز ( ﷺ ) دروستی كرد ناوی چی بوو ؟

و// مزگەوتی ( قباء ) .

پ٢٥/ دایەنەكە پێغەمبەر ( ﷺ ) ناوی چی بوو وە لە كام هۆز بوو ؟

و// خاتو ( حەلیمە ) ی كچی ( ابو ذؤیب ) لە هۆزی ( بەنی سەعد ) .

پ٢٦/ مەدینە ( ٣) هۆزی بەناو بانگی جولەكەی تیادا بوو ناوی ئەو هۆزانە چی بوو ؟

و// بنوقینقاع ، بنونضیر ، بنوقریضة

پ٢٧/ یەكەم پیاو ، ئافرەت ، منداڵ كە موسوڵمان بوون كێ بون ؟

و// پیاو : حەزرەتی ئەبوبەكری صدیق ، ئافرەت : خاتو خەدیجە ، منداڵ : حەزرەتی عەلی ( خوای لێ ڕازی بێت )

پ٢٨/ یەكەم كۆچ بۆ ئیسلام كرا ، بەرەو كوێ و چەند كەس بوون ؟

و// كۆچی جاری یەكەم بوو بەرەو ( حەبەشە ) ، دوانزە پیاو و چوار ئافرەت بوون .

پ٢٩/ لە كاتی گەڕانەوەی پێغەمبەر ( ﷺ ) لە( طائف )لە( وادی النحلة ) دا ڕوداوێكی گەورە ڕوی دا چی بوو ؟

و//كۆمەڵێك ( جن ) بە بیستنی قورئان سەرسام بوون و ئیمانیان هێنا بە پێغەمبەر ( ﷺ ) .

پ٣٠ / بەشدارانی خەڵكی مەدینە لە پەیمانی ( عەقەبەی یەكەم ) دا چەند كەس بوون ؟

و// پێنج كەس لە هۆزی ( خەزرەج ) و دوو كەس لە هۆزی ( ئەوس )

پ٣١/ ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ناوی چی بوو كە بەهۆی خواردنی گۆشتە ژەهراویەكەوە لە خەیبەردا شەهید بوو ؟

و// بیشری كوڕی مالیك ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣٢/ یەكەم خێزانی پێغەمبەر ( ﷺ ) كە لە دوای وەفاتی خاتوو خەدیجە خواستی كێ بوو ؟

و// خاتوو ( سەودەی كچی زەمعە ) بوو ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣٣/ لە ماڵی کێدا پێغەمبەر برایەتی خستە نێوان ( انصار و مهاجرین ) ، چەند کەس ئامادە بوون ؟

و// لە ماڵی ئەنەسی کوڕی مالیك ( خوای لێ ڕازی بێت ) ، ( ٩٠) کەس ئامادەبوون ، نیوەیان ( انصار ) و نیوەشیان ( مهاجر ) بوون .

پ٣٤/ ئەندازەی ئەشکەوتی ( حراء ) چەندە ؟

و// درێژییەکەی (٤ ) مەتر تولە ، پانییەکەیشی ( ١٫٧٥ ) تۆڵە ( ذراع ) .

پ٣٥/ کام هاوەڵی پێغەمبەر ( ﷺ ) خەوی بینی بە شێوازی بانگ دانەوە

و// عبد الله ی کوڕی زەید ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣٦/ ئەو شیعرە کامەیە کە پێغەمبەر لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقدا دەیفەرموو ؟

و// دەیفەرموو ( اللهم لاعیش إلا عیش الاخرة

فاغفر الانصار و المهاجرة )

پ٣٧/ هۆی هەڵگیرسانی جەنگی ( موئتە ) چی بوو ؟

و// کاربەدەستێکی قەیسەری پاشای ڕۆم لە ناوچەی ( بلقاء ) نامە بەرێکی پێغەمبەری شەهید کرد .

پ٣٨/ پێغەمبەر ( ﷺ ) دوای دەرچوون لە مەدینە بۆ گرتنی کاروانەکەی ( ئەبو سوفیان ) و پێش دەست پێکردنی دوو کەسی نارد هەواڵی کاروانەکە بزانن ، ئەو کەسانە کێ بوون ؟

و// ( بەس بەسی کوڕی عامر و عودەی کوڕی ئەبو زەغباء ) ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣٩/ پێغەمبەر ( ﷺ ) كە خاتوو خەدیجەی خواست تەمەنیان چەندبوو ؟

و// پێغەمبەر ( ﷺ ) تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو ، خاتوو خەدیجەش (٤٠) ساڵ بوو .

پ٤٠ / ئەو كەنیزەكەی بۆ یەكەمین جار لە دوای دایكی خۆی شیری دا بە پێغەمبەر ( ﷺ ) كێ بوو ؟

و// ناوی ( سوەیبە ) بوو . كەنیزەكی ( ئەبولەهەب ) ی مامی پێغەمبەر ( ﷺ ) .

پ٤١/ كە كەعبە بە هۆی لافاوەوە ڕوخا ئەو وەستا بەنایە ناوی چی بوو كە سەر لە نوێ بە فەرمانی عەرەبەكان دروستی كردەوە ؟

و// وەستا ( باقوم ) ی ڕۆمی .

پ٤٢/ پێغەمبەر ( ﷺ ) لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا بەشداری كام پەیمانی كرد ؟

و// پەیمانی ( حلف الفضول ) كە بە مەبەستی یارمەتی دان و پشتگیری لە ستەم لێكراوان بەسترا

پ٤٣/ كوڕەكانی پێغەمبەر ( ﷺ ) ناویان چی بوو ؟

و// (٣) كوڕ ( قاسم ، ابراهیم ، عبد الله ) .

پ٤٤/ ناوی كچەكانی پێغەمبەر ( ﷺ ) چی بوو ؟

و// (٤) كچ زەینەب ، روقیە ، ئومكەلسوم ، فاتمە .

پ٤٥/ لە گەشتی ( الاسراء و المعراج ) دا كام فریشتە هاوەڵی پێغەمبەر ( ﷺ ) بوو ؟

## فەرمانێك لە ------ (١٠٠٠) پرسیار

و// حەزرەتی جوبرەئیل ( سەلامی خوای لێ بێت ) .

پ٤٦/كام لە خێزانەكانی پێغەمبەر بە دایكی هەژاران ناسراوە ؟

و// خاتو ( زەینەبی كچی خوزەیمە ) ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٤٧/ یەكەمین سریە كە پێغەمبەر ( ﷺ ) بەڕێی خست ، بە فەرماندەیی كێ و چەند كەس بوون ؟

و// سریەی ( سیف البحر ) بە فەرماندەیی حەزرەتی ( حمزە ) . ( خوای لێ ڕازی بێت ) (٣٠) كەس بوون .

پ٤٨/ ژمارەی لەشكری موسوڵمانان و لەشكری بێ باوەڕان لە جەنگی بەدردا چەند بوو ؟

و// لەشكری ئیسلام ( ٣١٤) كەس و لەشكری بێباوەڕان ( ١٠٠٠ ) كەس

پ٤٩/ ئەو هاوەڵە بەڕێزە كێ بوو لە جەنگی ( ئوحد ) دا كە شەهید كرا فریشتەكان شۆردیان ؟

و// حنظلة ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٥٠ / چەند جار و لە كوێ سنگی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەتكراوە ؟

و// دوو جار یەكەم بە منداڵی لای دایەنەكەی ، دووەم : لە شەوی میعراج

پ٥١/ لە ساڵی ( ٧ ) ی كۆچیدا پێغەمبەر ( ﷺ ) نامەی نارد بۆ چەند پاشا و ئەمیرێك و بانگی كردن بۆ ئیسلام كێ بوون ؟

و// ئەجاشی / پاشای حەبەشە ، موقەوقسی پاشای میسر ، كیسرای پاشای فارس ، جەیفەری پاشای عومان ، مونزیری كاربەدەستی

( بەحرەین ) ، هەوزەی كاربەدەستی ( یەمامە ) ، حارسی غەسانی كاربەدەستی دیمەشق .

پ٥٢/ بۆ كام جەنگ بوو پێغەمبەر ( ﷺ ) سێ كەسی دیاری كرد بە تەرتیب فەرماندەیی بكەن ، ئەگەر هەركامیان شەهید بوون ، فەرماندەكان كێ بوون ؟

و// جەنگی ( موئتە ) فەرماندەكانیش ( زەیدی كوڕی حارثة ، جەعفەری كوڕی ابو طالب ، عبد الله ی كوڕی رواحة ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

٥٣/ ئەو ژنە ناوی چی بوو كە لە ( خیبر ) دا حەیوانێكی ژەهراوی كرد بۆ لەناو بردنی پێغەمبەر ( ﷺ ) ؟

و// زەینەبی كچی حارث .

٥٤/ پێغەمبەر ( ﷺ ) گۆچانێكی بەخشی بە هاوەڵێكی ، ئەویش وەسیەتی كرد گۆچانەكە بخەنە ناو كفنەكەی ئەو هاوەڵە كێ بوو ؟

و// عبد الله ی كوڕی ئەنیس ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

٥٥/ پێغەمبەر ( ﷺ ) كێلی نارد بۆ شكاندنی بتی ( عوزا ) ؟

و// حەزرەتی ( خالیدی كوڕی وەلید ) ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

٥٦/ كام وشانە لە پەیمانی ( دابڕین ) دا مۆریانە نەی خواردبوون ؟

و// وشەی ( بسمك اللهم ) وە هەموو ناوێكی پیرۆزی ( الله ) .

پ٥٧/ ئەو دوو ڕوو موناففە كێ بوو كە بە سەرۆكی دوو ڕووەكان دەناسرا، بەڵام كوڕەكەی هاوەڵێكی بەڕێزی پێغەمبەر بوو ؟

و// عەبدولای کوڕی نوبەی : کوڕەکەی حەزرەتی ( عبد الله ) بوو ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٥٨/ یەکەمین جەژنی موسوڵمانان لە چ ساڵێکدا بوو؟

و// یەکەمین جەژن جەژنی ( ڕەمەزان ) یساڵی دووی کۆچی بوو کە هاوکات بوو لەگەڵ جەژنی سەرکەوتن لە جەنگی بەدر دا

پ٥٩/ کەی ( قیبلە ) گۆڕا لە ( بیت المقدس ) ە وە بۆ کەعبەی پیرۆز ؟

و// مانگی شەعبانی ساڵی دووەمی کۆچی .

پ٦٠ / کام لە منداڵە کانی پێغەمبەر ( ﷺ ) لە ژیانی پێغەمبەر ( ﷺ ) وەفاتیان کردووە، وەکامیان کەوتە دوای خۆی ؟

و// هەموو منداڵەکانی پێغەمبەر ( ﷺ ) پێش خۆی وەفاتیان کرد بەلأم حەزرەتی ( فاتیمە ) ( ٦) مانگ لە دوای خۆی وەفاتی کرد

# ٧٥ پرسیار دەربارەی ژیانی پێغەمبەران



## خەرمانێك لە ----❀---- (١٠٠٠) پرسیار

پ١/ بە پێی فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) ژمارەی سەرجەم پێغەمبەران (رسول و نبی) چەندە ؟

و// (١٢٤٠٠٠) پێغەمبەر .

پ٢/ لە قورئانی پیرۆزدا ناوی چەند پێغەمبەر هاتووە؟

و// (٢٥) پێغەمبەر ناوی هاتووە.

پ٣/ کوڕە ئیماندارەکانی حەزرەتی نوح ناویان چی بوو ؟

و// (حام ، سام ، یافث) .

پ٤/ حەزرەتی (لوط) چ خزمایەتییەکی لەگەڵ حەزرەتی (ابراهیم) دا هەیە ؟

و/ حەزرەتی (لوط) برازای حەزرەتی (ابراهیم) بووە .

پ٥/ پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەی کام پێغەمبەرەوە فەرمویەتی : الكريم بن الكريم بن الكريم بن الكريم ؟

و// لە بارەی حەزرەتی (یوسف) ، چونکە کوڕی (یعقوب ، کوڕی ئیسحاق ، کوڕی ابراهیم بووە .

پ٦/ نازناوی (ذا النون) و (صاحب الحوت) هی کام پێغەمبەرە ؟ .

و// یونس پێغەمبەر .

پ٧/ مەزاری حەزرەتی (شیث) لە کوێ یە ؟

و// لە شاری (موسڵ) ە لە عێراق .

پ٨/ ناوی (موسی) بە زمانی میسری کۆن یانی چی ؟

و// واتە : لە ئاو دەرهێنراو .

# خەرمانێك لە ـــــ ® ــــــ (١٠٠٠) پرسیار

پ٩/ حەزرەتی ( شوعەیب ) بۆ سەر چ گەلێك نێرراوە ؟

و// بۆ سەر ئەهلی ( مەدیەن ) كە بە ( اصحاب الایكة ) ناسراون ،

پ١٠ / پێغەمبەرە خاوەن عەزمەكان ( اولو العزم ) كێن.

و// نوح ، ابراهیم ، موسى ، عیسى ، محمد

پ١١/ ئەو پیشە چی یە كە زۆربەی پێغەمبەرانی خوا كردویانە ؟

و/ پیشەی شوانیە .

پ١٢/ كام پێغەمبەر براكەیش پێغەمبەر بووە لەگەڵ خۆیدا ؟

و// حەزرەتی موسا ، براكەیشی ناوی حەزرەتی هارون بووە

پ١٣/ژنە ئیماندارەكەی فیرعەون ناوی چی بوو ؟

و// خاتوو ئاسیە

پ١٤/ كـــام پێغەمبـــەر توشـــی نەخۆشـــیەكی زۆر ســـەخت ، درێژ خایەن هات ؟

و// حەزرەتی ئەیوب .

پ١٥/ حەزرەتی ( لوط ) بۆ كوێ رەوانەكرا بە پێغەمبەر ؟

و// بۆ سەر ئەهلی ( سەدووم ) كە لە شوێنی ( البحر المیت ) دا بوون .

پ١٦/ كوڕی كام پێغەمبەر بە بێ باوەڕی وبە خنكان لە ناو چوو؟

و//كوڕێكی حەزرەتی ( نوح ) .

پ١٧/ كاتێك حەزرەتی( اسحاق ) لەدایك بوو حەزرەتی ( ابراهیم ) ؛ باوكی تەمەنی چەند بوو ؟

و// سەد ساڵ .

پ١٨/ حەزرەتی ( عیسی ) چەند لە حەزرەتی ( یحیی ) بچوکتر بووە ؟

و// حەزرەتی ( عیسی ) سێ مانگ دوای حەزرەتی ( یحیی ) لە دایك بووە

پ١٩/ ئەو دوو پێغەمبەرەی ژنەکانیان نمونەی بێ باوەڕین کێن ؟

و // ژنی حەزرەتی ( نوح ) ، ژنی حەزرەتی ( لوط ) .

پ٢٠/ ئەو دوعایەی حەزرەتی ( یونس ) لە سکی نەهەنگەکەدا خوێندی چی بوو ؟

و// لاإله إلا انت سبحانك إني كنت من الضالمين

پ٢١/ حەزرەتی ( یونس ) بۆ سەر کوێ ڕەوانە کرا بە پێغەمبەر ؟

و// بۆ سەر ئەهلی نەینەوا .

پ٢٢/ کام پێغەمبەر بووکەوەفاتیکرد تاماوەیەکی زۆر هەر پێی نەزانرا کە مردووە ؟

و// حەزرەتی سولەیمان .

پ٢٣/ حەزرەتی ( موسا ) چەند ساڵ شوانی کرد بۆ حەزرەتی ( شوعەیب ) ؟

و// ( ١٠) ساڵی ڕەبەق .

پ٢٤/ ( اصحاب الحجر ) کێن ؟

و// گەل ( ثمود ) ن کە گەلی حەزرەتی صالح بوون .

پ٢٥/ کام پێغەمبەر لە مانار لێکدانەوەی خەودا پسپۆڕ بووە ؟

و// حەزرەتی یوسف .

پ٢٦/ کەشتیەکەی حەزرەتی نوح لە کوێ نیشتەوە ؟

و// لەسەر کێوی ( جـودی ) لـە نزیك شـاری ( دیاربـەکر ) لـە کوردستانی تورکیا

پ٢٧/ شـەوی میعـراج پێغەمبـەر ( ﷺ ) لـە ئاسمـانی چوارەم دا کام پێغەمبەرەی بینی ؟

و// حەزرەتی ئیدریس

پ٢٨/ هاجەرە خاتوون و سارە خاتوون خێزانی کام پێغەمبەر بوون ؟

و// خێزانی حەزرەتی ابراهیم بوون

پ٢٩/ ئەو کێوە ناوی چیە کە بۆ یەکەم جار خوای گەورە لەسەری قسەی لەگەڵ حەزرەتی موسادا کرد ؟

و// کێوی ( طور )

پ٣٠/ حەزرەتی ( نوح ) چەند ساڵ بانگەوازی گەلەکەی کرد ؟

و// ( ٩٥٠ ) ساڵ .

پ٣١/ کە حەزرەتی موسا ( میسر )ی بەجێهێشت بەرەو کوێ هەڵهات ؟

و// ناوچەی ( مەدیەن ) .

پ٣٢/ موعجیزەی کـام لـە پێغەمبـەران حوشـترێکی زینـدوو بوو لـە بەردێلە هاتە دەرەوە ؟

و// موعجیزەی حەزرەتی ( صالح ) بوو .

پ٣٣/ کام پێغەمبەر ماڵی خوا ( کەعبەی پیرۆز ) ی بنیات نا ؟

و// حەزرەتی ابراهیم بە هاوکاری حەزرەتی اسماعیلی کوڕی

پ٣٤/ ئافە برا باوك و دایکیەکەی حەزرەتی یوسف ناوی چی بوو ؟

و// ناوی ( بنیامین ) بوو .

پ٣٥/ خوای گەورە كام پێغەمبەری لە فتوادانێكدا بە فریشتە تاقی كردەوە ؟

و// حەزرەتی داود لە كێشەی نێوان ( ٩٩ ) مەڕەكەدا .

پ٣٦/ كامیان : حەزرەتی موسا یان حەزرەتی هارون زوو وەفاتی كرد ؟

و// هارون زوتر وەفاتی كردوە

پ٣٧/ گەلەكەی ( حەزرەتی هود ) بەچی سزادران ؟

و// بە بایەكی توندی كوشندە كە ماوەی ( حەوت شەوو هەشت ڕۆژ ) بەردەوام بوو.

پ٣٨/ كام پێغەمبەر بوو بۆ خۆ لادان لە گوناهێك فەرمویەتی ( رب السجن احب الی مما یدعوننی الیه ) ؟

و// حەزرەتی یوسف .

پ٣٩/ ئەو پێغەمبەرەی بێ وێنە بووە لە دەنگ خۆشیدا ناوی چی یە ؟

و// حەزرەتی داود كە زەبوری خوێندوەتەوەو تەزبیحاتی كردوە بە دەنگە زوڵاڵەكەی .

پ٤٠ / كام لە پێغەمبەران باوكی نیە و كامیشیان باوك و دایكی نیە ؟

و// حەزرەتی ( ئادەم و حەزرەتی عیسا ) باوكیان نیە حەزرەتی ئادەم هەردوكیانی نیە .

پ٤١/ گەلەكەی ( حەزرەتی هود ) ناویان چی بوو ؟

و// گەل ( عاد ) كە لە ناوچەی الاحقاف نیشتە جێ بوون .

پ٤٢/ ( کلیم الله ) نازناوی کام پێغەمبەرەیە ؟

و// نازناوی حەزرەتی موسایە .

پ٤٣/کام‌پێغەمبەر بە شەپازلەیەك فریشتەی گیان کێشانی‌کوێر کردووە .

و//حەزرەتی موسا . بڕوانە سەرچاوەی ژمارە (٣٨)

پ٤٤/ ئەو بتە گەورەی کە گەلەکەی ( یونس ) دەیانپەرست ناوی چی بوو

و// بتی ( عەشتار ) .

پ٤٥/ قــارونی ســەرمایەداری ســتەم کــار لــە ســەردەمی کــام پێغەمبەردا بووە ؟

و// لە سەردەمی حەزرەتی موسا دا

پ٤٦/ کێ هەواڵی شاژنە ( بەلقیس ) گەیاندە حەزرەتی ( سولە یمان ) ؟

و// پەپو سلێمانە ( هُدهُد ) .

پ٤٧/ موعجیزەی زیندو کردنەوەی مردوو موعجیزەی کام پێغەمبەر بوو؟

و// موعجیزەی حەزرەتی عیسا بوو .

پ٤٨/ گەلەکەی حەزرەتی یونس چەند کەس بوون ؟

و// ( ١٠٠٠٠٠ ) کەس یان زیاتر .

پ٤٩/ کــوڕی کــام پێغەمبــەر بــوو یەکــەمین جــار مرۆڤــی کوشــت ، ناوی چی بوو ؟

و// قابیلی کوڕی حەزرەتی ئادەم

پ٥٠/ کام پێغەمبەر نمونە بووە لە جوانی دا ؟ .

و// حەزرەتی یوسف .

## خەرمانێك لە ـــــ❀ـــــ (١٠٠٠) پرسیار

پ٥١/ ( طالوت و جالوت ) كێ بوون ؟

و// طالوت پاشایەكی بەنو ئیسرائیلی بووە ، جالوت سەرۆكی بت پەرستە فەلەستینیەكان بووە .

پ٥٢/ كام پێغەمبەر بوو بۆ یەكەم جار كراسی زرێیتی دروست كرد ؟

و// حەزرەتی داوود .

پ٥٣/ ئەو دوعایەی حەزرەتی ئەیوب خوێندی لە كاتی نەخۆشیەكەیدا چی بوو ؟

و// رب اني مسني الضر وانت ارحم الراحمين .

پ٥٤/ كام پێغەمبەر بە شەپازلەیەك پیاوێكی ستەم كاری كوشت ؟

و// حەزرەتی موسا

پ٥٥/ كام پێغەمبەر لەترسی دەست درێژی كردن بە ژنەكەی خۆیە وت ئەمە خوشكمە ؟

و// حەزرەتی ئیبراهیم بە خاتوو سارەی ژنی : مەبەستی خوشكی ئاینی بوو .

پ٥٦/ دایكی حەزرەتی ئیسماعیل ناوی چی بوو ، وەدایكی حەزرەتی ئیسحاق ناوی چی بوو ؟

و// خاتوو ( هاجەر ) ، دایكی ئیسحاقیش ناوی خاتوو ( سارە ) بووە .

پ٥٧/ ئەو پێغەمبەرەی خوا ئاگری بەئاو بڵێسەداری بۆ سارد كردەوە كێ بوو ؟

و// حەزرەتی ئیبراهیم .

## خەرمانێك لە ـــــ❀ـــــ (١٠٠٠) پرسیار

پ٥٨/ ( الیاس و الیسع ) پێغەمبەری کێ بوون ؟

و// پێغەمبەری بەنو ئیسرائیل بوون .

پ٥٩/ کام پێغەمبەر لە قورئاندا باس کراوە کە زمانی گیاندارانی دەزانی؟

و// حەزرەتی سولەیمان .

پ٦٠/ حەزرەتی یەعقوب چاوە کوێرەکانی بەچی چاك بونەوە ؟

و// بە کراسەکەی حەزرەتی یوسفی کوڕی .

پ٦١/ یەکەم پێغەمبەر و دوا پێغەمبەر ناویان چی یە ؟

و// یەکەم پێغەمبەر ئادەم ، دوا پێغەمبەر محمد

پ٦٢/ نازناوی باوکی پێغەمبەران ( ابو الانبیاء ) هی کام پێغەمبەرە ؟

و// حەزرەتی ئیبراهیم .

پ٦٣/ ئەو گەلەی خوا بە قریشکەیەکی تۆقێنەر فەوتاندنی کێ بوون ؟

و// گەلەکەی حەزرەتی صالح و گەلەکەی حەزرەتی شوعەیب .

پ٦٤/ حەزرەتی موسا چەند کەسی هەڵبژارد بۆ میقاتی خوا تەوبەکردن لە پەرستنی گوێرەکەکە ؟

و// ( ٧٠ ) کەس .

پ٦٥/ حەزرەتی سولەیمان کوڕی کێ یە ؟

و// کوڕی حەزرەتی داوودە سەلامی خوایان لێ بێت .

پ٦٦/ بتەکانی گەلەکەی پێغەمبەر ( نوح ) ناویان چی بوو ؟

و// ( ود ، سواع ، یغوث ، یعوق ، نسر ) .

پ٦٧/ ئینجیل پەیامی كام پێغەمبەرەو ماناى چی یە ؟

و// پەڕاوی حەزرەتی عیسایە ، وشەیەكی یۆنانیە بەماناى موژدەیە

پ٦٨/ حەزرەتی ئیسحاق چەند جار لە قورئاندا ناوی هاتوە ؟

و// (١٧) جار .

پ٦٩/ كێ مژدەی دا بە حەزرەتی مەریەم كە منداڵی دەبێت ؟

و// حەزرەتی جوبرەئیل ( سەلامی خوای لێ بێت ) .

پ٧٠/ حەزرەتی یوسف لە خەویدا شتانێك كڕنوشیان بۆ دەبرد ، ئەو شتانە چی بوون ؟

و// خۆر ، مانگ ، یانزە ئەستێرە .

پ٧١/ ئەو پێغەمبەرەی باوكی كراوە بە قوربانی ، ئەو پێغەمبەرەی باوكی كردویەتی بە قوربانی ناویان چی یە ؟

و// یەكەم حەزرەتی ( محمد ) ە ، دووەم : حەزرەتی ( ئیسماعیل ) ە خوایلێی ڕازی بێت .

پ٧٢/ موعجیزەی دەستی سپی ( الید البیضاء ) هی كام پێغەمبەر بوو ؟

و// حەزرەتی موسا .

پ٧٣/ كام پێغەمبەر بەساوایی هاتوەتە قسەكردن ؟

و// حەزرەتی عیسا

پ٧٤/ حەزرەتی ( ذو الكفل ) كوڕی كام پێغەمبەر و خۆی ناوی چی بووە ؟

و// خۆی ناوی ( بشیر ) بووە ، كوڕی حەزرەتی ئەیوب بووە .

پ٧٥/ لـەو پێغەمبەرانـەی ناویـان لـە قورئـاندا هەیـە چـەندیان لە نەوەی حەزرەتی ( ئیبراهیم ) ن ؟

و// ( ١٨) پێغەمبەریان لە نەوەی حەزرەتی ( ئیبراهیم ) ن .

خەرمانێك لە ـــــ ❁ ـــــ (١٠٠٠) پرسیار

# ٦٥ پرسیار دەربارەی ڕەمەزانی پیرۆز



## خەرمانێك لە ـــــ❁ـــــ ( ١٠٠٠ ) پرسیار

پ١/ وشەی ( ڕەمەزان ) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای چی یە ؟

و/ واتە  زۆر زۆر گەرم

پ٢/ كام فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) ( ڕەمەزان ) بە گەورەی مانگەكا ناو دەبات ؟

و/ (سيد الشهور شهر رمضان وسيد الايام يوم الجمعة ) رواه الطبراني .

پ٣/ ئەو دەروازەی بەهەشت كە تایبەتە بە ڕۆژوو گران ناوی چی یە ؟

و/دەروازەی ( الريان ) واتە : پاراو .

پ٤/ لە ئیسلامدا چەند جۆر ڕۆژوو هەیە ؟

و/ چوار جۆر ( واجب ، سوننەت ، حەرام ، مەكروە ) .

پ٥/ كەی فەتحیشاری مەكەی پیرۆز كرا ؟

و/ (١٠) ی ڕەمەزانی ساڵی ( ٨) ی كۆچی

پ٦/ كێ بتی ( عوزا )ی شكاند و كەی بوو ؟

و/ خالیدی كوڕی وەلید ( ٢٥) ڕەمەزانی ساڵی ( ٨) ی كۆچی .

پ٧/ دوو ئایەت كە باسی شەوی ( قدر ) بكەن .

و/ ﴿ انا انزلناه في ليلة القدر ﴾ سورة القدر ١ ، ﴿ انا انزلناه في ليلة مباركة ﴾ الدخان ٣.

پ٨/ ڕۆژووی واجب چەند جۆری هەیە ؟

و/ یەك : ڕۆژووی ڕەمەزان ، دوو: ڕۆژووی كەفارەت سێ : ڕۆژووی نەزر .

پ٩/ مەرجەكانی واجب بونی ڕۆژوو چی یە ؟

و/ سێ مەرج ( موسوڵمانیەتی ، عاقڵیەتی ، باڵغ بوون ) .

پ١٠/ حوکمی درەنگ پارشێو کردن چی یە ؟

و/ سوننەتەو خێری زۆرە .

پ١١/ کەی ئیسلام لە وڵاتی یەمەن دا بڵاو بویەوە ؟

و/ لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ( ١٠) ی کۆچی .

پ١٢/ سوننەتە بە چی بەربانگ بکرێتەوە ؟

و/ ھەتا بکرێت بە خورما

پ١٣/ یوم الشك : کام ڕۆژەیە ؟

و/ ڕۆژی ( ٣٠ ) شەعبانە کەمانگ نەبینرێت .

پ١٤/ چەند جۆر کەفارەتی ڕۆژوو شکاندن ھەیە ؟

و/ ١- ئازاد کردنی کۆیلە ، ٢- : بەڕۆژووبوون ، ٣- خواردن دان ، ئەمانە بە پێی جۆری ڕۆژوو شکاندنەکە دەگۆڕێت .

پ١٥/ کێ و کەی ( ئەندەلوس ) ی ڕزگار کرد ؟

و/ طارقی کوڕی زیاد ، ( ٢٨) ی ڕەمەزانی ساڵی ( ٩٢ ) ی کۆچی .

پ١٦/ مەبەست لە وشەی ( الروح ) لە سورەتی ( قدر ) دا کێ یە ؟

و/ جوبرەئیل ( سەلامی خوای لەسەر بێت ) .

پ١٧/ حوکمی پەلە کردن لە بەربانگ کردنەوەدا چی یە ؟

و/ سوننەتە .

پ١٨/ ڕوداوی ( عین جالوت ) بە فەرماندەیی کێ بوو کەی ڕوی دا ؟

و/ سوڵتان ( قوطز ) (١٥) ی ڕەمەزانی ساڵی ( ٦٥٨) ی کۆچی .

پ١٩/ كام دوعایە سوننەتە شەوانی ( قدر ) زۆر بخوێنرێت ؟

و// ( اللهم انك عفو تحب العفو فاعف عنی ) رواه الترمذی .

پ٢٠/ بە چ عوزرێك موسوڵمان دەتوانێت بە ڕۆژوو نەبێت ؟

و// سەفەر ، نەخۆشی ، پیری ، سك پڕی ، شیر دان ، ترسی مرن لەبرسان یان تینواندا ، ناچار كردن بەزۆر بۆ ڕۆژوو شكاندن .

پ٢١/ غەزای بدری گەورە كەی ڕوی دا ؟

و// ڕۆژی هەینی ( ١٧) ی ڕەمەزانی ساڵی ( ٢) ی كۆچی .

پ٢٢/ مانگی ڕەمەزان چۆن دیاریدەكرێت ؟

و// بەبینینی مانگ ئەگەر سایەقە بوو ، كە نەبینرا بە تەواو كردنی ( ٣٠) ڕۆژەی مانگی ( شەعبان ) .

پ٢٣/ بە كام ئایەت ڕۆژوو فەرز كرا ؟

و// ﴿ یا ایها الذین امنوا كتب علیكم الصیام كما كتب علی الذین من قبلكم لعلكم تتقون ﴾ البقرة ١٨٣.

پ٢٤/ كەی ڕۆژوی ڕەمەزان فەرز كرا لەسەر موسوڵمانان ؟

و// ( ١٠ ) ی شەعبانی ساڵی ( ٢) ی كۆچی ، لە دوا ی گۆڕینی قیبلە ،

پ٢٥/ گەورەترین ڕوداو كە لە ڕەمەزاندا ڕویدا چی بوو ؟

و// هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆز بۆ پێغەمبەر ( ﷺ ) .

پ٢٦/ بۆنی دەمی ڕۆژەوان لای خوای گەورە لە بۆنی چی خۆشترە ؟

و// لە بۆنی میسك .

٢٧٦/ ئەو شتە گەورە گەورانە چین کە لەگەڵ هاتنی ڕەمەزان ڕوو دەدەن ؟

// دەروازەکانی بەهەشت دەکرێنەوە ، دەروازەکانی دۆزەخ دادەخرێن ، شەیتانەکان سنگ دەکرێن .

٢٨٠/ حوکمی زۆر ئاو ڕادانە ( دەم و لوت ) بۆ ڕۆژوو گر چی یە ؟

// کەراهەتی هەیە ، واتە باش نیە

٢٩٠/ جەنگی زولاقە لە نزیك ( ئەندەلوس ) کەی ڕوی دا ؟

// ( ٢٥) ی ڕەمەزانی ساڵی ( ٤٧٩ ) ی کۆچی .

٣٠٠ / کام فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەیسەلمێنێت ڕۆژوو مایەی تندروستی یە ؟

// ﴿ صوموا تصحوا ﴾ . رواه الطبراني وابن السني

٣١٠/ ڕۆژوو گرتن لە ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا چۆنە ؟

// حەرامە ڕۆژویان تیادا بگیرێت .

٣٢٠/ حوکمی سیواك کردن بۆ ڕۆژوو گر چی‌یە ؟

// تا بانگی نیوەڕۆ سوننەتە ، دوای ئەوە کەراهەتی هەیە تا بەربانگ .

٣٣٠/ حوکمی بۆنی خۆش لە خۆدان لە ڕەمەزاندا چی یە ؟

// کەراهەتی هەیە ، واتە : باش نیە .

٣٤٠/ شەوی قەدری پیرۆز کام شەوەی ڕەمەزانە ؟

// بەرای زۆربەی زاناکان شەوی ( ٢٧) ی ڕەمەزانە .

٣٥٠/ ڕەمەزان مانگی چەندەمی ساڵی کۆچی یە ؟

و// مانگی نۆیەمەو لە نێوان ( شعبان و شوال ) دایە .

پ٣٦/ بە چەند شاهید بینینی مانگی رەمەزان دەسەلمێت ؟

و// بە یەك شاهیدی پیاوی موسولمانی عاقڵی باڵغی راستگۆ .

پ٣٧ / ئیمامی شافیعی لە هەر رۆژێکی رەمەزان دا چەند قورئانی خوێندووە ؟

و// لە رۆژێکدا خەتمێکی کردووە .

پ٣٨/ قنوت لە نوێژی تەراویح دا لە کەیەوە دەخوێنرێت ؟

و// لە ( ١٥) ی رەمەزانەوە تا کۆتایی مانگەکە .

پ٣٩/ ئەو فەرموودە کامەیە دەیسەلمێنێت پارشێو بەرەکەتی تیایە !

و// ﴿ تسحروا فان في السحور بركة ﴾ متفق عليه

پ٤٠ / رۆژوو گرتنی پێغەمبەر داوود ( سەلامی خوای لەسەر ) چۆن بووە ؟

و// رۆژ نارۆژێك بە رۆژوو بووە

پ٤١/ کەی بتی ( لات ) شکێنرا ؟

و// رەمەزانی ساڵی ( ٩) ی کۆچی .

پ٤٢/ گەر بەربانگت لای کەسێك کردەوە سونەتە چی بڵێیت ؟

و// افطر عندكم الصائمون واكل طعامكم الابرار وصلت عليكم الملائكة .

پ٤٣/ فیدیەی رۆژوو لەسەر کێ واجبە ؟

و// ئەو کەسانەی عوزری شەرعیان هەیە و رۆژویان پێ ناگیرێت وەك پیری کەنەفت .

پ٤٤/ ڕۆژووی ( یوم الشك ) حوكمی چۆنە؟

و// حەرامە مەگەر كەسەكە ڕۆژووی فەرزی لەسەر بێت ، یاخود حاڵەتێكی تایبەتی ڕۆژووی سونەتی هەبێت و نەكرێت لێی لابدات .

پ٤٥/ حوكمی ڕۆژووگرتن بۆ ئافرەتێك لە بێ نوێژیدا بێت چۆنە ؟

و// حەرامە بەڕۆژوو بێت

پ٤٦/ چەند جار ناوی ڕەمەزان لە قورئاندا هاتووە ، كام ئایەتە

و// یەك جار ، ئایەتی ( ١٨٥) ی سورەتی ( البقرة ) .

پ٤٧/ ڕۆژووەوان دوو شادی هەیە كامانەن ؟

و// ١- خۆشی كاتی بەربانگ كردنەوە ، ٢- خۆشی كاتی پاداشت وەرگرتنەوەی لە قیامەتدا

پ٤٨/ بۆ ڕزگار كردنی كەسێك لە خنكان لە ئاودا ئایا دروستەڕۆژووەوان ڕۆژوەكەی بشكێنێت ؟

و// واجبە ڕۆژوەكەی بشكێنێت بۆ ڕزگار كردنی ئەو كەسە لە مردن .

پ٤٩/ دوعای بەربانگ كردنەوە چی یە ؟

و// ﴿ اللهم لك صمت وعلى رزقك افطرت و عليك توكلت و بك امنت ذهب الضمأ و ابتلت العروق وثبت الاجر انشاء الله تعالى ﴾ .

پ٥٠/ بە ئەنقەست سەرفیترەدان بخرێتە ڕۆژی دوەمی جەژن چۆنە ؟

و// حەرامە بەئەنقەست دوا بخرێت .

پ٥١/ لەكەیەوە دروستە سەرفیترە دەربكرێت ؟

و// لــە لای هــەندێك لــە زانایــان هــەر لەیەكــەم ڕۆژی ڕەمەزانــەوە دروستە بدرێت

پ٥٢/ جەنگی ( تەبوك ) كەی ڕوی دا ؟

و//هەندێك لە ڕوداوەكانی لە ڕەمەزانی ساڵی ( ٩ ) ی كۆچی دا بوون .

پ٥٣/ بۆچی درەنگ پارشێو كردن سونەتە .

و// ١- كاتەكەی كاتیسەحەرەو بەرەكەتی تیادایە ، ٢- تا مرۆڤ زوو برسی نەبێت

پ٥٤/ ڕۆژوو گرتنی ( وصال ) چۆنە ؟

و// ئەوەیە ڕۆژوی ئەمڕۆ بدرێتە ئەم ڕۆژوی سبەینێ و بەربانگ نەكرێتەوەو شەویش هیچ نەخورێت .

پ٥٥/ حوكمی ( صوم الوصال ) چۆنە ؟

و// پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی مەیكەن .

پ٥٦/ جیاوازی ڕۆژوی موسوڵمانان و ڕۆژوی ئەهلی كتاب چی یە ؟

و// خواردنی پارشێو یەكێكە لە جیاوازیە گرنگەكان .

پ٥٧/ پێغەمبەر (ﷺ) لــە ڕەمــەزانی هــەر ســاڵێكدا چــەند ڕۆژ ئیعتیكافی كردووە ؟

و// ( ١٠ ) ڕۆژ بەڵام لە ساڵی وەفاتیدا ( ٢٠ ) ڕۆژ .

پ٥٨ / حیكمــەتی چیــە ڕۆژوی ( دووشــەممە و پێنــج شــەممە ) سوننەتە ؟

و// لەو دوو ڕۆژەدا كردەوەی مرۆڤ دەبرێتە بەر بارەگای خوایی .

پ٥٩/ كام جۆری ڕۆژوو دەكرێت تا نیوەڕۆ نیەتی بۆ بهێنرێت ؟

و// ڕۆژووی سوننەت .

پ٦٠/ چەند ساڵ جارێك ڕەمەزان دەگەڕێتەوە بۆ هەمان شوێنی لە ساڵدا ؟

و// ( ٣٦ ) ساڵ جارێك .

پ٦١/ كەی پەڕاوەكانی ( ابراهیم ) ( تورات ، ئینجیل ) هاتونەتە خوارەوە

و// پەڕاوەكان ( ١ ) ی ڕەمەزان ، تەورات ( ٦ ) ی ڕەمەزان ، ئینجیل (١٣) ی ڕەمەزان

پ٦٢/ ئەندازەی سەرفیترە بۆ هەر كەسێك چەندە ؟

و// یەك ( صاع ) لەو خواردنەی لە وڵاتەكەدا زۆر زۆر دەخورێت .

پ٦٣/ ڕۆژوو گرتنەكەی حەزرەتی مریەم چۆن بووە ؟

و// ڕۆژووی بێدەنگی ، واتە : هیچ قسەیەكی نەدەكرد .

پ٦٤/ بۆچی ڕۆژووی ڕەمەزان+شەشەڵان وەكو ڕۆژووی ساڵێك وایە ؟

و// پاداشتی چاكە بە ( ١٠ ) قاتە بەلایەنی كەمەوە ، كەواتە ٣٦ × ١٠ قات = ٣٦٠ ڕۆژ .

پ٦٥/ بە پێی فەرمودەیەكی پێغەمبەر ( ﷺ ) سێ شت هەیە لە ئەخلاقی پێغەمبەرانی پێشویشدا بووە ، چین ؟

و// درەنگ پارشێو كردن ، زوو بەربانگ كردنەوە ، پێش خستنی لای ڕاست بەسەر لای چەپدا .

# ٨٠ پرسیار
# دەربارەی
# جێنشینەکانی پێغەمبەر



## خەرمانێك لە ـــــــ۞ــــــ (۱۰۰۰) پرسیار

پ۱ / لە چ شوێنێكدا ئەبوبەكر هەڵبژێرراو كرا بە جێنشینی پێغەمبەر ( ﷺ ) ؟

و۱ // لە جێگەیەكدا بوو ، كە بە ( سەقیفەی بەنی ساعیدە ) ناسرابوو .

پ۲ / حەزرەتی عومەر كەی موسوڵمان بوو ؟

و۲ // سێ ڕۆژ دوای موسوڵمان بوونی حەمزە ، لە ساڵی ( ٦ ) ی پێغەمبەرایەتیدا

پ۳ / حەزرەتی عوسمان لەسەر دەستی كێدا موسوڵمان بوو ؟

و۳ // لەسەر دەستی حەزرەتی ئەبوبەكردا خوا لێیان ڕازی بێت .

پ٤ / كام تاوانبار حەزرەتی عەلی شەهید كرد ؟ وە لە كوێ ؟

و٤ // عەبدوڕەحمانی كوڕی مەلجەم ، لە مزگەوتی شاری ( كوفە ) دا .

پ٥ / ئەبوبەكر پێش موسوڵمان بوونی بە چ ناوێك ناسرابوو ؟

و٥ // بە ناوی ( عەتیق ) .

پ٦ / كام لە خەلیفەكان بە ئاشكرا كۆچی كرد بۆ مەدینە ؟

و٦ // حەزرەتی عومەری كوڕی خەتتاب .

پ٧/ نازناوی ( أمير المؤمنين ) یەكەم جار بەكێ بەخشرا ؟

و٧ // بە حەزرەتی ( عومەر ) بەخشرا ، ـ خوای لێ ڕازی بێت .

پ٨ / ئەو دوو كچەی پێغەمبەر ( ﷺ ) كە ژنی حەزرەتی عوسمان بوون ناویان چی بوو ؟

و٨ // ( روقیە ) و ( ئوم كە لثوم ) .

پ٩ / حەزرەتی عەلی لە تەمەنی چەند ساڵیدا موسوڵمان بوو ؟

و٩ // لە تەمەنی ( ٥٥ ) ساڵیدا

پ١٠ / دوا وتەی حەزرەتی ئەبوبەکر لەسەرەمەرگیدا چی بوو ؟

و١٠ // دوعای ( توفني مسلماً والحقني بصالحين )

پ١١ / کام خەلیفە بوو بەرواری ساڵی کۆچی داهێنا ؟

و١١ // حەزرەتی عومەر بوو .

پ١٢ / کێ حەزرەتی عومەری ناونا ( فاروق ) و بۆ ؟

و١٢ // پێغەمبـــەر ( ﷺ ) نـــاوی نـــا ، چونکـــە هـــەق و ناهـــەقی لێك جیا کردەوە .

پ١٣ / حەزرەتی عومەر چەند منداڵی هەبوو ؟

و١٣ // نۆ کوڕ و ، پێنج کچی هەبوو .

پ١٤ / نازناوی حەزرەتی عوسمان چی بوو ؟ بۆچی ؟

و١٤ // ( ذوالنورێـــن ) بـــوو ، چونکـــە پێغەمبـــەر ( ﷺ ) دوو کچـــی خۆی پێدابوو .

پ١٥ / پێغەمبەر ( ﷺ ) بە کام خەلیفەی فەرموو : ئایا ڕازیت بەوەی تۆ بۆ من وەکو هارون وابیت بۆ موسا ؟

و١٥ // بە حەزرەتی ( عەلی ) فەرموو .

پ١٦ / هـــەر لەســـەرەتای موســـوڵمان بوونیـــەوە ئەبوبـــەکر ( ٥ ) کەسی لەگەڵ خۆی موسوڵمان کرد ، کێ بوون ؟

و١٦ // ( عثمان بن عفان ـــ زبير ـــ طلحة ـــ عبدالرحمن بن عوف ـــ سعد بن ابي وقاص ) بوون .

پ١٧ / كام خەلیفە بوو ، كە جەماعەتێكی نوێژی عەسری لە كیس چوو ، لە حەقیداباخێكی بەخشی ؟

و١٧ //حەزرەتی ( عومەر ) بوو ــ خوای لێ رازی بێت .

پ١٨ / كام خەلیفە بوو ( شجرة الرضوان )ی بڕی و بۆ چی ؟

و١٨ // حەزرەتی ( عومەر ) بوو ، تا نەبێتە مەنزلگەیەك بۆ شیرك .

پ١٩ / فەرموودەیەكی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەبارەی گەورەیی عومەرەوە بلێ

و١٩ // پێغەمبەر ( ﷺ ) فەرموویەتی : ( ان الله تعالى جعل الحق على لسان عمر وقلبه ) . رواه احمد .

پ٢٠ / شێخ حەسەنی بەصری چ ناوێكی لە حەزرەتی عەلی ناوە ؟

و٢٠ // ناوی نابوو : دنیا نەویستی ( رەبانی ) ئەم ئوممەتە .

پ٢١ / لەسەر دەستی كام خەلیفەدا یەكەمین جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوەكاندا ڕوویدا ؟

و٢١ // حەزرەتی ( ئەبوبەكری صدیق ) ــ خوای لێ ڕازی بێت .

پ٢٢ / ناوی چوار لە كوڕەكانی حەزرەتی عومەر چی بوو ؟

و٢٢ // ( عبد الله ، عبد الرحمنی گەورە ، ناوەنجی ، بچووك ) .

پ٢٣ / بە چیدا حەزرەتی ( عومەر ) زانی ( ئەبولؤلوئە ) نیازی خراپە لەگەڵیدا ؟

و٢٣ // حەزرەتی ( عومەر ) پێی وت : ئەڵێن ئەتوانی ئاشی هەوایی دروست بکەیت ! ئەویش وتی : ئاشێکت بۆ دروست ئەکەم لەناو خەڵکیدا دەنگ بداتەوە ! .

پ٢٤ / کێ بوو یەکەمین جار مزگەوتی پێغەمبەری لە مەدینە گەورە کرد و فراوان تری کرد ؟

و٢٤ // حەزرەتی ( عومەر ) .

پ٢٥ / حەزرەتی عومەر چەند کەسی دانا کەلە دوای خۆی خەلیفە یەکێك لەوانە بێت ؟

و٢٥ // شەش کەس .

پ٢٦ / حەزرەتی عوسمان حەزرەتی ( ئەبوزەر )ی بۆ کوێ دوور خستەوە ؟

و٢٦ // بۆ ناوچەی ( زبرە ) کە جێگەیەکی دوورە لە شاری مەدینەوە .

پ٢٧ / حەزرەتی عەلی کەی شەهید کرا ؟

و٢٧ // لە نوێژی بەیانی ڕۆژی هەینی ( ١٨) ی ڕەمەزانی ساڵی ( ٤٠ )ی کۆچی ، لەتەمەنی ( ٥٨ ) ساڵیدا .

پ٢٨ / پێغەمبەر ( ﷺ ) زاوای کام لە خەلیفەکان بوو ؟

و٢٨ // زاوای حەزرەتی ( ئەبوبەکر ) و حەزرەتی ( عومەر ) بوو .

پ٢٩ / کام خەلیفە بوو لە وەفاتی پێغەمبەردا ( ﷺ ) فەرمووی : خەڵکینە هەرکەس ( محمد ) دەپەرستێت ، ئەوە ( محمد ) مردووە ، هەر کەسیش خوا دەپەرستێت ، ئەوە خوا ماوە و زیندووە ؟

و٢٩ // حەزرەتی ( ئەبەبەکری صدیق ) بوو .

پ٣٠ / کام خەلیفە سەرزەمینی ئیسلامی کرد بە چەند هەرێم ( ولایت ) و ناوی هەندێکیان چی بوون ؟

و٣٠ // حەزرەتی ( عومەر ) : ویلایەتی بەصرە ، ویلایەتی کوفە ، ویلایەتی فسطاط ..... هتد .

پ٣١ / حەزرەتی ( عومەر ) بە خوێندنی کام ئایەتی قورئانی پیرۆز موسوڵمان بوو ؟

و٣١ // سەرەتای سورەتی پیرۆزی ( طه ) .

پ٣٢ / بۆچی حەزرەتی عوسمان لە غەزای بەدردا بەشداری نەکرد ؟

و٣٢ // چونکە خاتوو ( روقیة )ی خێزانی زۆر نەخۆش بوو .

پ٣٣شمشێرەکەی حەزرەتی ( عەلی ) ناوی چی بوو ؟

و٣٣ // شمشێری ( ذوالفقار ) .

پ٣٤/ کام لە خەلیفەکان زاوای پێغەمبەر بوو ؟

و٣٤ // حەزرەتی ( عەلی ) و حەزرەتی ( عوسمان ) .

پ٣٥ / حەزرەتی ( عەلی ) پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەردا ( ﷺ ) چۆن بوو ؟

و٣٥ // هەم ئامۆزای پێغمبەر ( ﷺ ) هەم زاوای بوو .

پ٣٦ / کام خەلیفە خۆی ڕشاندەوە چونکە یەك پارووی گومان لێکراو بە حەرامی خستیە دەمی ؟

و٣٦ // حەزرەتی ( ئەبوبەکر ) بوو ــ خوای لێ ڕازی بێت .

خەرمانێك لە ــــــ﷽ــــ (١٠٠٠) پرسیار

پ٣٧ / زۆر جار قورئانی پیرۆز تەئیدی ڕاو بۆچوونی کام لە خەلیفەکانی کردووە ؟

و٣٧ // حەزرەتی ( عومەر ) .

پ٣٨ / حەزرەتی ( عومەر ) بانگی لە کێ کرد لە وڵاتی خۆراساندا ، خوا بانگەکەی گەیاندە گوێی ؟

و٣٨ // حەزرەتی ( ساریة ) لە خۆراسانەوە گوێی لە هاوارەکەی ( عومەر ) بوو لە مەدینەدا !

پ٣٩ / کام خەلیفە بوو ، زۆر جار دەستی لە ئاگر نزیك دەخستەوە و دەیوت : ئاخەی بزانم سەبرت هەیە لەسەر ئاگر ؟

و٣٩ // حەزرەتی ( عومەری کوڕی خەتتاب ) ــ خوای لێ ڕازی بێت .

پ٤٠ / پێغەمبەر ( ﷺ ) کام خەلیفەی ناو ناوە : ( یەکەم کۆچکەر بەڕێی خوادا ) ، دوای حەزرەتی لوط ؟

و٤٠ // حەزرەتی ( عوسمانی کوڕی عەففان ) ــ خوای لێ ڕازی بێت .

پ٤١ / کام بیر بوو حەزرەتی عوسمان لە جولەکەیەکی کڕی و بەخێر دا بە موسوڵمانان ؟

و٤١ // بیری ( رومە ) بوو لەشاری مەدینە .

پ٤٢ / وتە : ( كلمة حق يراد به باطل ) فەرموودەی کێیە ؟

و٤٢ // فەرموودەی ( عەلی کوڕی ئەبوتالیبە ) ــ خوای لێ ڕازی بێت .

پ٤٣ / فەرموودەی : ( ئەگەر هەژاری پیاوێك بوایە . ئەوا دەم کوشت ) هی کێیە ؟

و٤٣ // فەرموودەی حەزرەتی ( علی ) ە

پ٤٤ / ئەو میراتەی لە ( ئەبوبەکر ) بە جێ ما چی بوو ؟

و٤٤ // تەنها حوشترێك و عەبایەك و قاپێكی شیر دۆشین بوو ..

پ٤٥ / كام خەلیفە بوو بۆ یەكەمین جار ( بیت المال )ی دامێنا ؟

و٤٥ // حەزرەتی ( عومەر ) ــ خوای لێ ڕازی بێت .

پ٤٦ / كام خەلیفە بوو بۆ یەكەمین جار سەلامی نوێژی بە دەنگی بەرز دایەوە ؟

و٤٦ // حەزرەتی ( عومەر ) .

پ٤٧ / كام خەلیفە لە نوێژی تەراویحی نیوەی دووەمی مانگی ڕەمەزاندا ، بۆ یەكەمین جار قنوتی خوێند ؟

و٤٧ // حەزرەتی ( عومەری خەتتاب ) .

پ٤٨ / مــۆرە ئەنگوســتیلەییەكی پێغەمبــەر ( ﷺ ) لای كــام لــە خەلیفەكان بزر بوو ؟

و٤٨ // لەدەستی ( عوسمانی كوڕی عەففان ) كەوتە بیری ( ئەریس )ەوە .

پ٤٩/ جەنگی ( صەففین ) و جەنگی ( جەمەل ) لەسەردەمی كام خەلیفەدا بوو ؟

و٤٩ // لەسەر دەمی حەزرەتی ( علی ) دا .

پ٥٠ / ئەوانەی حەزرەتی ( عوسمــان ) قورئانەكــەی پــێ نوسـیەوە كێ بوون ؟

و٥٠ // زید بن ثابت ، عبدالله بن زبیر ، عبدالرحمن بن حارث ، سعید عاص .

پ٥١ / لەشكری دەریایی ئیسلامی ، بۆ یەكەمین جار لە لایەن كێوە دامەزرا ؟

و٥١ // لە لایەن حەزرەتی ( عوسمان ) ەوە بوو .

پ٥٢ / كام جولەكە بوو لەسەردەمی ( عوسمان ) دا سەری ئاشوب و فیتنە گێڕی بوو ؟

و٥٢ // ( عبدالله ی كوڕی سەبەو ) بوو .

پ٥٣ / كام خەلیفە بوو بۆ یەكەمین جار نوێژی تەراویحی كرد بە جەماعەت ؟

و٥٣ // حەزرەتی ( عومەری كوڕی خەتتاب ) بوو .

پ٥٤ / بە پێی كام فەرموودەی پێغەمبەر ( ﷺ ) ، عوسمان هاوەڵی پێغەمبەرە لە بەهەشتدا ؟

و٥٤ // ( لكل نبي في الجنة رفيق .... ورفيقي في الجنة عثمان ) .

پ٥٥ / كام خەلیفە بە منداڵی لە ماڵی پێغەمبەردا ( ﷺ ) ژیاوە ؟

و٥٥ // حەزرەتی ( عەلی ) لە تەمەنی شەشە ساڵیەوە .

پ٥٦ / بۆچی بۆ خەلیفەكانی تر دەوترێت : ( رضي الله عنه ) بەڵام بۆ حەزرەتی ( عەلی ) دەوترێت ( كرم الله وجهه ) ؟

و٥٦ // چونكە هەرگیز لە ژیانیدا كڕنووشی بۆ بت نەبردووە .

پ٥٧ / كە پێغەمبەر (ﷺ) برایەتی خستە نێوان موسوڵمانەكانەوە ، كێی هەڵبژارد بۆ برایەتی خۆی ؟

و٥٧ // حەزرەتی ( عەلی )

پ٥٨ / كام خەلیفە لە سەرەمەرگی پێغەمبەردا (ﷺ) ، ئیمامەتی نوێژی كرد بۆ موسوڵمانان ؟

و٥٨ // حەزرەتی ( ئەبوبەكر ) .

پ٥٩ / لە كام ساڵدا حەزرەتی ( عومەر ) بە سكی خۆی وت : بقۆڕێنە ...... تا خەڵك نە بوژێنەوە جگە لە زەیت هیچی تر نیە بت دەمێ ؟

و٥٩ // لە ساڵی گرانی ( الرمادة )دا بوو .

پ٦٠ / لە ( بیعة الرضوان ) دا ، پێغەمبەر (ﷺ) لە جیاتی كام خەلیفە خۆی بەیعەتی بە خۆی دا ؟

و٦٠ // لە جیاتی حەزرەتی ( عوسمان ) دەستێكی خۆی خستە ناو دەستەكەی تری خۆی .

پ٦١ / ئەو دوو پاشا ساسانیە لەسەردەمی حەزرەتی ( عوسمان ) دا كوژران ، كێ بوون ؟

و٦١ // پاشا ( یەزد و جورد ) بوون .

پ٦٢ / كام خەلیفە بوو پێغەمبەر (ﷺ) دوعای كرد لە خوا هیدایەتی بدات ؟

و٦٢ // حەزرەتی ( عومەر ) بوو .

پ٦٣ / كە پێغەمبەر ( ﷺ ) كۆچی كردبۆمەدینەو شەوە كام خەلیفە لە جێگەكەیدا خەوت ؟

و٦٣ // حەزرەتی ( عەلی ـــ شێری خوا ـــ ) .

پ٦٤ / كام خەلیفە لە هەمووان بەشەرم تر بووە و ، فریشتەكانیش شەرمیان لێ كردووە ؟

و٦٤ // حەزرەتی ( عوسمان ) ـــ خوای لێ ڕازی بێت ـــ .

پ٦٥ / ئەو كتێبە بە نرخە كامەیە كەوا مەشهورە ( ئیمام عەلی ) دایناوە ؟

و٦٥ // كتێبی ( نهج البلاغة )یە .

پ٦٦ / كام لە خەلیفەكان بە نەخۆشی وەفاتی كرد ؟

و٦٦ // تەنها حەزرەتی ( ئەبوبەكر ) ، چونكە ( عمر و عثمان و علي ) شەهید كران .

پ٦٧ / ناوی دوو كچی ناوداری حەزرەتی ( ئەبوبەكر ) چی بوو ؟

و٦٧ // خاتوو ئەسما و ( ذات النطاقين ) ، دایكی ئیمانداران ( عائشة ) .

پ٦٨ / دوای چوار خەلیفەكە بەیعەت بە كێ درا ببێت بە خەلیفەی موسولمانان ؟

و٦٨ // بەیعەت درا بە حەزرەتی ( حەسەنی كوڕی ئیمامی عەلی ) .

پ٦٩ / كام خەلیفە ( بیلال ) و ( عەماری كوڕی فەهیرە )ی لە بەندایەتی ئازاد كرد ؟

و٦٩ // خەلیفە ( ئەبوبەكر ) كڕینی و ئینجا ڕزگاری كردن لە بەندایەتی

٧٠ / حەزرەتی ( ئەبوبەكر ) ماوەی چەند ساڵ خەلیفەی موسوڵمانان
بوو ؟

٧٠ // دوو ساڵ و سێ مانگ و دە شەو .

٧١ / حـــەزرەتی ئەبوبـــەكر لـــەكام پشـــتی دا دەگاتـــەوە بـــە
پێغەمبەر ( ﷺ ) ؟

٧١ // لە ( مورڕەی كوڕی كەعب ) دا

٧٢ / یەكەم كەس كە بەیعەتی دا بە حەزرەتی ئەبوبەكر كێ بوو ؟

٧٢ // حەزرەتی ( عومەری كوڕی خەتتاب ) بوو خوای لێ ڕازی بێت .

٧٤ / كــە پێغەمبــەر ﷺ وەفــاتی كــرد ، كــام خەلیفــە لاشــەی
عەزی شۆرد ؟

٧٤ // حەزرەتی ( عەلی ) بە هاوكاری چەند هاوەڵێكی تر .

٧٥ / حەزرەتی عوسمان لە تەمەنی چەند ساڵیدا شەهید كرا ؟

٧٥ // لە تەمەنی ( ٨٢ ) ساڵیدا و بەزمانی بە ڕۆژوو .

٧٦ / ماوەی خەلافەتی حەزرەتی ( عەلی ) چەند بوو ؟

٧٦ // پێنج ساڵ و شەش مانگ بوو .

٧٧ / پێغەمبـــەر ( ﷺ ) بـــە كـــام لـــە خلیفـــەكانی فـــەرموو :
انت ابو التراب ) ؟

٧٧ // بە حەزرەتی ( عەلی ) فەرموو ، چونكە لەسەر زەوی خەوتبوو .

٧٨ / كام خەلیفە لەپاڵ كەعبەدا لە یەك ڕكات نوێژدا هەرهەموو
قورئانی خوێندەوە ؟

و٧٨ // حەزرەتی ( عوسمان ) بوو ـ خوای لێ ڕازی بێت .

پ٧٩ / كام خەلیفە بوو جارێكیان هەواڵی كوژرانی بڵاو بوویەوە ، كەچی وانەبوو ؟

و٧٩ // حەزرەتی ( عوسمان ) بوو ، لە وەختی ( بیعة الرضوان ) دا .

پ٨٠ / تا پێغەمبەر ( ﷺ ) لە ژیاندا مابوو ، حەزرەتی ئەبوبەكر ئیمامەتی چەند نوێژی كرد ؟

و٨٠ // حەڤدە نوێژ ، زۆر زۆر هەوڵی دا پێغەمبەر ( ﷺ ) ئیمامەتەكە بە كەسێكی تر بسپێرێ ، بەڵام ڕازی نەبوو.

خەرمانێك لە ----- ❁ ----- (١٠٠٠) پرسیار

# ١٠٠ پرسیار دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەر



## خەرمانێك لە ------ ﴿﴾ ----- (١٠٠٠) پرسیار

پ١/ كـام هـاوەڵ لـەكاتی گەڕانـەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) لـە طـائف موسڵمان بوو ؟

و/ حەزرەتی عەدداس ، كەخەڵكی نەینەوا بوو (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٢/ كام لەهاوەڵان بە(حبر الأمة) ناسراوە ؟

و/ عەبدوڵڵای كوری عەبباس (خوای لێ ڕازی بێت )

پ٣/ (سەلمانی فارسی) خەڵكی كوێیە ؟

و// گوندی (جەییان) ،نزیك شاری ئەصفەهانی ئێران ،

پ٤/ زیاتر لە(دە) جار كە پێغەمبـەر (ﷺ) دەچوو بۆ غـەزا ، شار مەدینەی دەسپارد بەكام هاوەڵ؟

و// عەبدوڵڵای كوری ئوممو مەكتووم (خوای لێ ڕازی بێت )

پ٥/( ئەبووعوبەیدەی جەراح) لەسەر دەستی كێ موسڵمان بوو؟

و// ئەبوبەكری صددیق (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٦/ لەكام جەنگدا (عەكرەمەی كوڕی ئەبوجەهل) شەهید بوو ؟

و// لەجەنگی (یرموك ) دا.

پ٧/ ( سەلمانی فارسی ) بە چ نیشانەیەك پێغەمبەر ی (ﷺ ) ناسیەوە !

و// لـەخێر و زەكـاتی نـەدەخوارد . لەدیاریەكـەی دەخـوارد . مـۆر پێغەمبەرایەتی لەنێو شانیدا بینی

پ٨/كام هاوەڵ بە ( ذات النطاقين ) بەناوبانگ بوو؟

و/ خاتوو ئاسمائی كچی ئەبوبەكر (خوای لێ ڕازی بێت ) ،

پ٩/ كام هاوەڵ ناسراوە بەوەی فریشتەكان شەرمیان لێ كردوە ؟

فەرمانێك لە ــــــــ﴿ــــــ (١٠٠٠) پرسیار

و// عوسمانی كوڕی عەففان (خوای لێ ڕازی بێت)

پ١٠/ كام هاوەڵ وتوویەتی: من چاكترین و خراپترین كەسم كوشتووە؟

و// وەحشی كوڕی حەرب (خوای لێ ڕازی بێت).

پ١١/ (عەبدوڵلای كوڕی عەبباس) چەند ساڵ تەمەنی كرد؟

و// حەفتاو یەك ساڵ

پ١٢/ كێ فەرماندە (موجزئەی سەددوسی) شەهید كرد؟

و// (هورمزان)ی سەركردەی فارسەكان.

پ١٣/كام هاوەڵ لە (بەدر)دا باوكی خۆی كوشت؟

و// ئەبو عوبەیدەی جەراح (خوای لێ ڕازی بێت)

پ١٤/ لەكام غەزا دا (عەبدوڵلای كوڕی ئوممو مەكتووم) شەهید كرا؟

و// لەجەنگی (قادسیە) دا، كە بەكوێری ئاڵا هەڵگری ئیسلام بوو.

پ١٥/ مەزاری (سەلمانی فارسی) لەكوێیە؟

و// لە شارۆچكەی (سەلمان پاك) كەلە نزیك شاری بەغدادەوەیە.

پ١٦/ پێغەمبەر (ﷺ) بەكێ ی فەرموو: باسی هەركەسێكیان بۆ كردبم دوایی كەدیومە، كەمتر بووە لەوەی كە بۆیان باس كردووم.. تۆ نەبێت؟

و// (زيد الخيل)، كە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی گۆڕی (زيد الخير).

پ١٧/ئەسعەدی كوڕی زورارە لە گەورە پیاوانی كام هۆز بوو؟

و// لە تیرەی (بەنی نەججار) ە لەهۆزی (خەزرەج).

پ١٨/ كام هاوەڵ بە تاكتیكێك سكی پێغەمبەر ی (ﷺ) ماچ كرد؟!

و// ئوسەیدی کوڕی حوضەیر (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ١٩/ کێ بوو بە بێ باوەڕانی ووت : چیم هەیە بۆ ئێوە ، بەو مەرجەی ڕێگەی کۆچ کردنم لێ نەگرن ؟

و// صوهەیبی ڕۆمی (خوای لێ ڕازی بێت )

پ٢٠/ لەکام غەزا دا ( زەیدی کوڕی حاریسە ( خوای لێ ڕازی بێت ) شەهید کرا

و// لە غەزای (مؤتە) دا ، کەخۆی فەرماندە بوو تیایدا

پ٢١/ کێ حەزرەتی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت ) شەهید کرد ؟

و// عەبدوڕەحمانی کوڕی مەلجەم .

پ٢٢/ کێ حەزرەتی عومەری (خوای لێ ڕازی بێت ) شەهید کرد ؟

و// ئەبوو لوئلوئەی فەیروزی

پ٢٣ / یەکەم شەهید لەئیسلام دا کێ یە ؟

و// خاتوو سوومەیەی دایکی عەممار ((خوایان لێ ڕازی بێت ) ) .

پ٢٤/ کێ فەرماندەی جەنگی ( تەبووك ) بوو، تەمەنی چەند بوو ؟

و// ئوسامەی کوڕی زەید ، تەمەنی لە (١٨ ساڵ تێپەڕی نەکرد )بوو

پ٢٥ / بۆ بە عوسمانی کوڕی عەفان دەوترێت (ذو النورين ) ؟

و// چوونکە پێغەمبەر (ﷺ) دوو کچی خۆی ( روقیـة ، أم کلثـوم ) ی پێ دابوو .

پ٢٦ / ئەو(دە ) کەسەی موژدەی بەهەشتیان پێ دراوە ، کێ بوون ؟

## خەرمانێك لە ــــــــ ❁ ــــــ (١٠٠٠) پرسیار

و// حەزرەتی ( ئەبوو بەكر ، عومەر ، عوسمان ، عەلی ، ئەبوو عوبەیدە ، سەعد ، سەعید ، زوبێر ، تەلحە ، عبدوڕەحمانی كوڕی عەوف ،( خوایان لێ ڕازی بێت ) .

پ٢٧/ ئەبوو هورەیرە ڕۆژی چەند جار تەسبیحاتی كردوە ؟

و// ڕۆژی ( دوانزە هەزار ) جار تەسبیحاتی كردوە .

پ٢٨/ بیرۆكەی هەڵكەندنی خەندەق لەمەدینە دا ، هی كێ بوو ؟

و// سەلمانی فارسی (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٢٩/ پێغەمبەر (ﷺ ) بەكێ ی فەرموو ( مرحبا" بمن عاتبنی فیه ربي ) ؟

و// عەبدوڵڵای كوڕی ئوم مەكتوم (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣٠ / كێ یەكەمین كەس بوو لەگۆڕستانی (بقیع) ی پیرۆز نێژرا ؟

و// عوسمانی كوڕی مظعون (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣١ / كە پێغەمبەر (ﷺ ) گەیشتە مەدینە ، لای دایە ماڵی كام هاوەڵ

و// ئەبو ئەیوبی ئەنصاریی (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣٢/ كەی ئەبووسوفیان و عەبباسی مامی پێغەمبەر موسڵمان بوون ؟

و// لەكاتی فەتحی مەككەی پیرۆز دا .

پ٣٣ / لە غوحود دا ئاڵای موسڵمانان بەدەستی كام هاوەڵ بوو ؟

و// موصعەبی كوڕی عومەیر (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣٤/ كام هاوەڵ ، گەر جەماعەتی عیشای لەدەست بچوایە ، ئیتر لەبریدا ئەو شەوە تابەیانی عیبادەتی دەكرد ؟

و// عەبدوڵڵای کوڕی عومەری خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٣٥/ پێغەمبەر (ﷺ) بەکێ‌ی فەرموو (مرحبا" بالراكب المهاجر) ؟

و// عیکرمەی کوڕی ئەبوجەهل (خوای لێ ڕازی بێت).

پ٣٦/ کام هاوەڵ بتی (عوززا)ی شکاند ؟

و// خالیدی کوڕی وەلید (خوای لێ ڕازی بێت).

پ٣٧/ کام هاوەڵ بە (أمين الأمة)ناسراوە ؟

و// ئەبوو عوبەیدەی جەڕاح (خوای لێ ڕازی بێت).

پ٣٨/ ئەنەسی کوڕی مالك ماوەی چەند ساڵ خادیمی پێغەمبەر (ﷺ) بوو؟

و//ماوەی (١٠) ساڵ، لەتەمەنی (١٠ ـ٢٠) ساڵی.

پ٣٩/ دوان لەنازناوەکانی (ئیمامی عەلی خوای لێ ڕازی بێت) چی‌یە ؟

و// شێری خودا، (أبو التراب)

پ٤٠/ لەسەردەمی کام خەلیفەدا کوردستان ڕزگار کرا ؟

و// عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت).

پ٤١/ یەکەمین بەندە کەموسڵمان بوو، کێ بوو ؟

و// بیلالی حەبەشی (خوای لێ ڕازی بێت).

پ٤٢/ ناوی ئەصڵی (ئەبو دەرداو) چی‌یە ؟

و//عومەیری کوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت).

پ٤٣/ ناوی کام هاوەڵ بەڕاشکاوی لە قورئاندا هاتووە ؟

و// زەیدی کوڕی حارسە (خوای لێ ڕازی بێت).

پ٤٤ / کێ حوسێنی کوڕی عەلی شەهید کرد؟

و// شیمری کوڕی ذو الجوشن

پ٤٥ / ناوی دووان لەشاعیرانی پێغەمبەر (ﷺ) چییە ؟

و// (حەسەنی کوڕی ثابت ) و ( عبدوللای کوڕی رەواحە)

پ٤٦/ کام هاوەڵ کەشەهید بوو لە ئوحودا، فریشتەکان شۆردیان ؟

و// حەنزەلە (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٤٧ / ئایەتی ﴿یاأیها الذین آمنوا لاتتخذوا عدوي و عدوكم أولياء﴾

لەبارەی کێ هاتە خوارەوە ؟

و// حاتەبی کوڕی ئەبولبەلتەعە (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٤٨/ گۆڕی (ئەبو ئەیووبی ئەنصاری ) لەکوێ یە؟

و// لە قوستەنتینیە ( ئەستەنبوول ).

پ٤٩/ کێ سەلامەکەی خوبەیبی شەهیدی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ ) ؟

و// جبریل (سەلامی خوای لێ بێت ) .

پ٥٠ / پێغەمبەر (ﷺ) چ نازناوێکی لە ( طلحة) ناوە؟

و// ( الفیاض ) : زۆر بەخشندەیی و دەست بەخێر .

پ٥١/ ئەو وتە شیرینە چی یە کە پێغەمبەر (ﷺ ) بە(سەلمانی فارسی)

فەرمووە ؟

و/ سلمان منا ، اهل البيت .

پ ٥٢/ جەعفەر و کۆچەرانی تری حەبەشە ، لەپەنای کێ دابوون ؟

و// پاشای حەبەشە ، کەناوی (ئەجاشی ) بوو .

پ٥٣ / کام هاوەڵ لەسەرەمەرگیدا دەگریا ، لەداخی ئەوەی شەهید نەبووە و لەسەرجێگا دەمرێ ؟

و// خالیدی کوڕی وەلید (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٥٤/ کەی ( عەدەی کوڕی حاتەمی طائی ) موسڵمان بوو ؟

و// ساڵی نۆیەمی کۆچی

پ٥٥ / پێغەمبەر (ﷺ) ناوی دوو ڕووەکانی لای کێ ئاشکرا کردبوو ؟

و// حوزەیفەی کوڕی یەمان (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٥٦/ ناوی ئەصڵی ( ابو ذر الغفاری ) چی‌یە ؟

و// جوندوبی کوڕی جونادە (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٥٧/ ( ابو ذر ) لەچ ساڵێکدا وەفاتی کرد ؟

و// لەساڵی (٣٢) ی کۆچی دا

پ٥٨/ کە ( ئوسەیدی کوڕی حوضیر ) وەفاتی کرد ، چەند قەرزار بوو ؟

و// چوار هەزار درهەم ، کەبۆ ئەوسەمە زۆر بوو.

پ٥٩/ کە پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد ، تەمەنی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس چەند بوو ؟

و// تەنها سیازدە ساڵ .

پ٦٠/ ئەو فەرموودانەی ( ابن عباس ) گێڕاونیەتەوە لە صەحیحی (بخاری و مسلم ) دان چەندن ؟

و// ژمارەیان (١٦٦٠) فەرموودەیە

پ٦١/ كام هاوەڵ (دە) برای خۆی و (٤٠٠) كەس لەمزەینەكەی لەسەر دەستیا موسڵمان بوون ؟

و// نوعمانی كوڕی موقرین (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٦٢/ نوعمانی موزەینی لەكام جەنگدا شەهید بوو ؟

و// لەجەنگی ( نەهاوەند ) ، كەبە ( فتح الفتوح ) ناسراوە .

پ٦٣/ كام ئایەت لەبارەی (صوهەیبی رۆمی) یەوە (خوای لێ ڕازی بێت)هاتە خوارەوە ؟

و// ئایەتی ﴿ ومن الناس من یشتري نفسه ابتغاء مرضات الله ....... ﴾ البقرة/ ٢٠٧.

پ٦٤/ هاوەڵان چ نازناوێكیان لە ( زەیدی كوڕی حاریسە ) نابوو ؟

و// نازناوی (( حب رسول الله )) ،خۆشەویستی پێغەمبەری خوا .

پ٦٥/ ئە وسێ فەرماندەیە كێ بوون كە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ غەزای (مؤتە) دیاری كردن و بەڕێز شەهید كران ؟

و// زەیدی كوڕی حاریسە ـ جەعفەری كوڕی ئەبوتالیب ـ عەبدوڵڵای كوڕی ڕەواحە (خوا لیان ڕازی بێت )

پ٦٦/پێغەمبەر (ﷺ) بەكام دوو منداڵەی دەفەرموو ( اللهم إني احبهما ، فاحبهما ) ؟

و// ئوسامەی كوڕی زەید و حەسەنی كوڕی عەلی

پ٦٧ / كام هاوەڵ و بۆماوەی چەند ڕۆژ فێری زمانی ( سریانی ) بوو ؟

و// زەیدی كوڕی ثابت ، لەماوەی (١٧) ڕۆژ دا

پ٦٨/ فاتیمەی خوشکی حەزرەتی عومەر هاوسەری کێ بوو ؟

و// هاوسەری سەعیدی کوڕی زەید (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٦٩/ پێغەمبەر (ﷺ) کام هاوەڵی ماچ کرد بەمردوویی و بۆی گریا ؟

و// عوسمانی کوڕی مەزعوون (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٧٠/ چاوێکی کام هاوەڵ لە ئوحود دا دەرهات و پێغەمبەر (ﷺ) دەستی پیا هێنا و چاك بوویەوە ؟

و// ( قەتادەی کوڕی نوعمان ) (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٧١/ ( عوبادەی کوڕی صامت ) چەند فەرموودەی گێڕاوەتەوە ؟

و// سەدوو هەشتا و یەك فەرموودە .

پ٧٢/ کە حەزرەتی عومەر چوو بۆ قودس ، کێ‌ی لە سەر مەدینە جێ هێشت ؟

و// عەلی کوڕی ئەبوتالیب (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٧٣/ یەکەمین شەهیدی شەڕی ( ئوحود ) کێ بوو ؟

و// ( عەبدوڵلای کوڕی عەمری ئەنصاری ).

پ٧٤/ خوا لاشەی کام هاوەڵی بە لافاو و پورەی هەنگ لە دەستی بێ باوەڕان پاراست ؟

و// عاصمی کوڕی ثابت (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٧٥/ حەزرەتی (حەمزە) (خوای لێ ڕازی بێت) چی پێغەمبەر (ﷺ) بوو ؟

و// هەم مامەی بوو ، هەم برای شیری بوو .

پ٧٦/ کێ خاتوو سوومەیەی دایکی عەماری شەهید کرد ؟

و// ئەبوجەهلی خوانەناس

پ٧٧ / کام ئایەت لەبارەی (عەماری کوڕی یاسر)ەوە ، هاتووەتە خوارەوە ؟

و// ﴿ الا من أكره وقلبه مطمئن بالايمان ﴾ النحل /١٠٦

پ٧٨/ کێ بیلالی حەبەشی لەبەندایەتی ڕزگار کرد ؟

و// ئەبوبەکری صدیق (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٧٩/ هاوەڵان لەسەرەتای بانگەوازدا لەکوێ کۆ دەبوونەوە ؟

و // لەماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبو ئەرقەم ـ لەمەککە

پ٨٠ / کێ لەجەنگی ئوحود دا ئەبوجەهلی کوشت ؟

و// دوو گەنج بەناوی ( موعازی کوڕی عەمر ، موعازی کوڕی عەفراو )

پ٨١/ سەرکردەی تیرهاوێژەکانی سەر کێوی ئوحود ، کێ بوون ؟

و// عەبدوڵلای کوڕی جوبەیر (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٨٢/ کام هاوەڵ یەکەم بانگوێژە لە ئیسلام دا ؟

و// بیلالی حەبەشی (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٨٣/ سیان لەنووسەرانی وەحی کێن؟

و// زوبەیری کوڕی عەوام ـــ معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان ـــ عەمری کوڕی عاص

پ٨٤/ ئەو سێ هاوەڵە بێ عوزرلە تەبووك دا بەجێ مان ، کێ بوون؟

و// کەعبی کوڕی مالك ـ هیلالی کوڕی ئومەیە ـ مەرارەی کوڕی ڕەبیع .

پ٨٥/ کام هاوەڵ لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بوو ، کاتێ چوو بۆ طائیف ؟

و/ ( زەیدی کوڕی حاریسە ) (خوای لێ ڕازی بێت )

پ٨٦/ ( جەعفەری کوڕی ئەبوو تالیب و هاوەڵانی ) کەی لە حەبەشە گەڕانەوە ؟

و/ لەکاتی فەتحی قەڵای (خەیبەر ) دا گەیشتنەوە ناو مەدینە

پ٨٧/ کام هاوەڵ دوعای کرد بەشەهیدی مەکی بەرێ و پارچە پارچە بکرێ لەبەر خوا ؟

و/ عەبدوڵلای کوڕی جەحش بوو ، خوا دوعاکەی گیرا کردوو و لەجەنگی (ئوحود) دا شەهید کرا

پ٨٨/ کام هاوەڵ لەفەتحی مەککەدا ، بۆ کوشتنی پێغەمبەر هات ، کەچی موسڵمان بوو ؟

و/ فەزالەی کوڕی عومەیر (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٨٩/ باوکی کام هاوەڵ بوو ، سەرۆکی دوو ڕووەکان بوو ؟

و/ عبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی .

پ٩٠/ کەی ( سوراقەی کوڕی مالیك ) ئیمانی هێنا ؟

و / لەوکاتەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) لەڕێگای کۆچەکەیدا بوو بۆ مەدینە .

پ٩١/ ( موصعەبی کوڕی عومەیر ) کەی شەهید بوو ؟

و/ لەجەنگی ئوحود ، لەساڵی کۆچی .

پ٩٢/ کام هاوەڵ شەل بوو ، زۆرداوای بەشداری جەنگی ئوحودی کرد ؟

و/ ( عەمری کوڕی جەموح ) ، لەو جەنگەشدا شەهید بوو .

پ٩٣/ سەعدی کوڕی موعاز ، لەکام جەنگدا و بەچی شەهید بوو ؟

و/ بەتیرێك لەجەنگی (خەندەق) دا .

پ٩٤/ کام هاوەڵ بەکوشتنی زەهراوی ژنە جولەکەکە شەهید بوو ؟

و/ بیشری کوڕی بە راء (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٩٥/ پێغەمبەر کێی لە مەککە بەجێ هێشت ، تاخەڵکەکەی شارەزای ئیسلام بکات ؟

و/ موعاذی کوڕی جەبەل (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٩٦/ کام هاوەڵی سەرکردە عێراق و وڵاتی فارسی ڕزگار کرد ؟

و/ سەعدی کوڕ ی ئەبی وەقاص (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٩٧/ خزمایەتی نێوان پێغەمبەر (ﷺ) و (عبدوڵڵای کوڕی جەحش) چۆنە ؟

و / عەبدوڵڵا پورزای پێغەمبەر (ﷺ) بوو .

پ٩٨/ کام هاوەڵ بە (المقرئ) و (معلم المدینه) بەناوبانگە ؟

و/ موصعەبی کوڕی عومەیر (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٩٩/ کام هاوەڵ ، موسەیلەمەی درۆزن پارچە پارچە گۆشتی لێ بڕی تا شەهید بوو ؟

و/ ( حەبیبی کوڕی زەید ) (خوای لێ ڕازی بێت) .

١٠٠/ کە پێغەمبەر (ﷺ) چووە سەر تەرمی (جولەیبیب) چی فەرموو ؟

و/ دوو جار فەرمووی : ( هذا مني ، وانا منه ) ، ئەمە لەمنە و منیش لەئەوم !.

خەرمانێك لە ــــ*ــــ (١٠٠٠) پرسیار

# ٧٠ پرسیار دەربارەی

# ڕۆژی قیامەت ، بەهەشت ، دۆزەخ



## خەرمانێك لە ـــــ❀ــــ (١٠٠٠) پرسیار

پ١/ كێ سەرپشك دەكرێ لەنێوان مانەوە لە دونیا یاخود مردن دا ؟

و// تەنها پێغەمبەرانی خوا ـ سەلامی خوایان لەسەر بێت .

پ٢/ كام ئایەت بەڵگەی ئاشكرایە لەسەر بوونی سزای ناو گۆڕ ؟

و// ﴿ النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾ الغافر/٤٥.

پ٣/ كە قیامەت نزیك دەبێتەوە ، لە كوێ چیایەكی ئاڵتوونی دەدۆزرێتەوە ؟

و// لەژێر ئاوی ڕووباری ( فورات ) دا .

پ٤/ بۆ چی بە جەجاڵ دەوترێت ( مسیح )؟

و// چوونكە لایەكی ڕوومەتی چاو و برۆی پێوە نیە و سڕاوەتەوە .

پ٥/ كە قیامەت نزیك دەبێتەوە ، كێ (كەعبە)ی پیرۆز دەڕوخێنێت ؟

و// پیاوێكی حەبەشی قاچ و قوڵ باریكە ( ذو السويقتين ).

پ٦/ پاش گەڕانەوەی ، حەزرەتی عیسا ، تاكەی لەسەر زەوی دەمێنێتەوە ؟

و// ماوەی (٤٠) ساڵ دەمێنێتەوە .

پ٧/ ئایا كەس لەگوشاردنی گۆڕ ڕزگاری دەبێت ؟

و// نەخێر تەنانەت موسڵمانانیش ، بگرە منداڵی بێ گوناهیش ڕزگاری نابێت

پ٨/ كام فریشتە فوو دەكات بە كەڕنا ( صور )دا؟

و// ئیسرافیل (سەلامی خوای لێبێت ) .

پ٩/ قیامەت لەچ ڕۆژێکی هەفتەدا ڕوودەدات ؟

و// لەڕۆژی (هەینی )دا

پ١٠/ لەڕۆژی قیامەتدا کێ یەکەمین کەس لاشەی پۆشتە دەکرێتەوە و بەرگی پێ لەبەر دەکرێت ؟

و//حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێ بێت )

پ١١/ لەڕۆژی قیامەتدا ، خۆر تاچەندە لە ڕاسەری خەڵکی نزیك دەبێتەوە ؟

و// ئەندازەی ( یەك میل ) دەمێنێتەوە بگاتە سەر سەری خەڵکی

پ١٢/ ( ١٤) ناوی قیامەت بڵێ کە بە ( یوم ) دەست پێ بکات ؟

و// ( یوم الخروج ، یوم البعث ، یوم الآزفة ، یوم التغابن ، یوم الفصل ، یوم التناد ، یوم الجمع ، یوم التلاق ، یوم الخلود ، یوم الحسرة ، یوم الدین ، یوم الحساب ، یوم القیامة ، یوم الآخر ) .

پ١٣ / لەکوێی لاشەی جەجاڵدا نووسراوە ( کافر ) ؟

و// لەنێو چاوانیدا نووسراوە ، بەڵام تەنها ئیمانداری ڕاستەقینە پێی دەزانێت

پ١٤/ جەجاڵ چەند منالی هەیە ؟ .

و// منداڵی نییەو ، نەزۆك و ( عقیم )ە .

پ١٥/ لە قورئانی پیرۆزدا بەچ ناوێك باس لە فووکردن بە ( صور ) دا دەکات ؟

هەرمانێك لە ـــــــ ( ١٠٠٠ ) پرسیار

و// فووی جاری یەكەم ( الراجفة ) و ( الصیحة ) ، فووی جاری دووەم ( الرادفة )

پ١٦/ چەند جار فوو دەكرێت بە كەرەنادا ( صور )دا ؟ وەنێوانیان چەند ؟

و// دوو جار لە فەرموودەدا هاتووە كەماوەی نێوانیان (چل) ە بەلام دیاری نەكردووە (چل ساڵ یان مانگ یان چی

پ١٧/ ژمارەی پاسەوانانی دۆزەخ چەندن ؟

و// (١٩) فریشتەن زۆر زۆر بەهێز و جەربەزەن

پ١٨/ كێ یەكەمین كەس دەچێتە ناو بەهەشتەوە ؟

و// پێغەمبەرمان محمد (ﷺ)

پ١٩/ بەهەشتی‌یەكان بەتەمەنی چەند ساڵی‌یەوە دەچنە ناو بەهەشتەوە ؟

و// تەمەنی (٣٣) ساڵی .

پ٢٠/ كێ گەورە لاوانی بەهەشتە ؟

و// ( ئیمام حەسەن و ئیمام حوسەین ) كوڕانی حەزرەتی عەلی (خوایان لێ ڕازی بێت ) .

پ٢١/ كێ گەورە بەتەمەن و پیرانی بەهەشتە ؟

و// حەزرەتی ئەبوبكری صدیق و عومەری كوڕی خەتاب (خوایان لێ ڕازی بێت ) .

پ٢٢/ كێ گەورە ئافرەتی بەهەشتە ؟

---

خەرمانێك لە ـــــ❁ـــــ (١٠٠٠) پرسیار

و// خەدیجەی کچی خوەیلید ، فاتیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) مەریەمی کچی عیمران ، ئاسیای کچی موزاحیم (ژنی فرعەون) .

پ٢٣/ دۆزەخ چەند دەرگای هەیە ؟

و// حەوت دەرگای هەیە ، لەمانگی ڕەمەزانان دادەخرێن .

پ٢٤/ قەدی درەختەکانی بەهەشت لەچی دروست کراوە ؟

و// لە ( ئالتوون )

پ٢٥/ لاشەی بێباوەڕان لەدۆزەخدا چەند گەورە دەکرێت و ، بۆ چی ؟

و// هێندەی ئەوەی کە ددانێکی کاکیلەیان هێندەی چیای (ئوحود) گەورە دەبێت ئازیاتر و زۆرتر سزا بچێژن.

پ٢٦/ پێغەمبەر (ﷺ) داوای کردوە کە دوعای بۆ بکەین کام پلەی بەرزی بەهەشتی بدرێتێ ؟

و// پلەی (( الوسیلة )) ، لەخوای گەورە دەخوازین بیداتێ ،

پ٢٧/ ناوی چوار جۆر لەشەرابی دۆزەخی یەکان چی یە؟

و// ( الغسلق ـ الحمیم ـ الصدید ـ المهل ) .

پ٢٨/ منداڵ بوون لەبەهەشتدا چەندە دەخایەنێت ؟

و// هێندەی کەسەکە خۆی حەز بکات ، هەرئەوەندە دەخایەنێت .

پ٢٩/ هەندێك لەناوەکانی دۆزەخ چی یە؟

و// ( لضى ـ الحطمة ـ السعیر ـ سقر ـ الهاویة ـ الجحیم ).

پ٣٠/ مەبەست لەزاراوەی ( قیامەتی بچوك ) چی یە ؟

## خەرمانێك لە ــــــ(١٠٠٠) پرسیار

و// مردن چونكە مردنی هەركەسێك نیشانەی قیامەتی بچووكی ئەو كەسەیە

پ٢١ / مەبەست لەژیانی (بەرزەخ) چی یە ؟

و// ئەو ماوەیەیە كەلەنێوان (مردن) و زیندوو بوونەوەدایە بۆ حەشر .

پ٢٢/ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هاتنی من و هاتنی قیامەت وەكوو چی وایە ؟

و// ( پەنجەی شایەتومان ) و ( پەنجەی ناوەڕاستی ) جووت كردوە و ، فەرموویەتی هاتنی من و هاتنی قیامەت ئاوا لەیەك نزیكە .

پ٢٣/ ئاگرێك لەحیجاز كەوتەوە ، زانایان بەیەكێك لەنیشانەكانی قیامەت یان دانا، كەی بوو ؟

و// ئەوئاگرە لەساڵی (٦٥٤)ی كۆچی دا ، كەوتەوە

پ٢٤/ لەدوا زەماندا ، چەند جەجاڵ سەرهەڵ ئەدەن ؟

و// بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) : (٢٧) یان (٣٠) جەجاڵ .

پ٢٥/ یەكێك لەنیشانەكانی قیامەت ، گۆڕینی مانگە چۆن ؟

و// مانگی یەك شەوە هێندەی مانگی ( سێ شەوە و چوار شەوە ) گەورە دیار ئەبێت .

پ٢٦/ ئایەتێك بڵێ بە ئگە بێت لەسەر دانانی تەرازوو (میزان) بۆ كردەوەی ئینسان لە قیامەت دا ؟

و// ئایەتی ( والوزن یومئذ الحق ) الاعراف/٧ .

پ٢٧/ ناوی دوو دانە لەدرەختەكانی بەهەشت چی یە؟

## فەرمانێك لە ـــــ ❁ ـــــ (١٠٠٠) پرسیار

و// ١. درەختی (سدرة المنتهی) ، ٢ . درەختی (طوبی) .

پ٣٨/ نیشانە گەورەکانی قیامەت چین ؟

و// هاتنی جەجاڵ ، هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە ، هاتنی یەئجوج و مەئجوج، هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا ، کەوتنەوەی ئاگرێکی گەورە لەیەمەن ، (هتد ١٠ نیشانەیە ) .

پ٣٩/ لەئاخر زەماندا چەند جار و لەکوێ زەوی رۆ ئەچێت(خسف) روو ئەدات ؟

و// سێ جار لە ڕۆژئاوا ، لەڕۆژ هەڵات ، لە نێوە دوورگەی عەرەبی

پ٤٠/ جیاوازی لەنێوان وشەی ( مەسیح ) پێغەمبەر و ، (مەسیح ) جەجاڵ دا چییە ؟

و// ( مەسیح ) پێغەمبەر ( فیعل) ی بەمانای ( فاعل ) ە ، واتە نەخۆشی چاك کردوەتەوە بەفەرمانی خوا ، ( مەسیح ) جەجاڵ ( فیعل) ی بەمانای ( مفعول) ە ، واتە چاو برژی سڕاوەتەوە

پ٤١/ ئاگری دۆزەخ چەند لەئاگری دنیا بەتین ترە ؟

و// حەفتا ئەوەندەی ئاگری دنیا گەرمتر و بەتین ترە .

پ٤٢/ سوکترین سزای دۆزەخ چۆنە ؟

و// دوو پشکۆ ئەخرێتە ژێر دوو پێی کەسە دۆزەخیەکە ، هێندە گەرمە خێرا مێشکی دێنێتە کوڵ

پ٤٣/ پێغەمبەر (ﷺ) ج شتێکی ناو ناوە ( هادم اللذات ) ؟

هەرمانێك لە ــــــ ❀ ــــــ ( ١٠٠٠ ) پرسیار

و// مردن ، چونکە پشتی شارەزووە سەرکەشەکانی ئادەمیزاد دەشکێنێ و ، تام وچێژە دنیایی یەکان لەلای بێ نرخ دەکات

پ٤٤/ ( یەئجووج ، مەئجووج ) کەی پەیدا دەبن ؟

و// دوای هاتنە خوارەوەی حەزرەتی عیسا و کوژرانی دەجال .

پ٤٥/ دەجال چەند رۆژ لەزەوی دا دەمێنێتەوە ؟

و// چل رۆژ ، یەکەم رۆژی درێژی ساڵێکە ، دووەم رۆژی درێژی مانگێکە سێیەم رۆژی درێژی هەفتەیەکە ، رۆژەکانی تری وەك رۆژانی سادە وان .

پ٤٦/ حەزرەتی عیسا لەچ ساتێکدا دێتە خوارەوە ولە کوێ ؟

و// لەساتی نوێژی بەیانی دا ، لای منارەیەکی سپی لە رۆژهەڵاتی شاری ( دیمشق ) .

پ٤٧/ کام ئایەتی قورئان باسی ( دابة الأرض ) دەکات ؟

و// ﴿ وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِنَ الأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لاَ يُوقِنُونَ ﴾ النمل/٨٢.

پ٤٨/ ئەو نیشانە گەورەیەی قیامەت کەپەیوەندی بە (خۆر)ەوە هەیە ، چی یە؟

و// هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە .

پ٤٩/ کێ یەکەمین کەس دێتە دەرەوە و بەرەو حەشر دەکەوێتە رێ ؟

و// پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) .

پ٥٠/ ئەو فریشتانە ناویان چی یە کەپرسیار دەکەن لەمردووی ناو گۆڕ؟

و// دوو فریشتەی ڕەنگ ڕەشن ناویان فریشتەی (نەکیر و مونکەر)ە.

پ٥١/ سێ ناوی قیامەت بڵێ کە بە(دار) دەست پێ بکات؟

و// (دار الآخرة، دار القرار، دار الخلد).

پ٥٢/کەی بەهەشت و دۆزەخ دروست دەکرێن؟

و// لەپێش دروستکردنی ئەم بوونەوەرە.

پ٥٣/ بەهەشت چەند دەرگای هەیە و، کامە دەرگایان تایبەتە بە ڕۆژووانانەوە؟

و// هەشت دەرگا، دەروازەی (الریان)

پ٥٤/ ئادەمیزادەکان چۆن حەشر دەکرێن؟

و// بەڕووت و قووتی، بەپێ پەتی و، بەخەتەنە نەکراوی.

پ٥٥/ یەکەم شت کە (محاسبة)ی ئادەمیزادی پێ دەکرێت چییە؟

و// نوێژە فەرزەکانیەتی.

پ٥٦/ حەوزی (کوثر) چۆنە؟

و// بۆنی لەمیسک خۆشترە لەبەفر و شیر سپی ترە، لەهەنگوین شیرین ترە، پەرداخەکانی لەژمارەی ئەستێرەکان زیاترە و لەزێڕ و زیو دروست کراون.

پ٥٧/ ڕۆژی قیامەت چەندە درێژە؟

و// پەنجا هەزار ساڵ، ﴿ تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴾ المعارج ٤٠.

پ٥٨/ دوا دوعایەک کەبە بەهەشتییەکان دەیخوێنن، کامەیە؟

خەرمانێك لە ـــــــــ(١٠٠٠) پرسیار

و// دەڵێن ﴿ الحمدلله رب العالمين ) ، بەپێی ئایەتی ( وآخر دعواهم ان الحمد لله رب العالمين ).

پ٥٩/ لە قورئاندا ناوی سێ ( كانی ) بەهەشت هاتووە ، كامانەن ؟

و// كانی (كافور) ، كانی (تەسنیم) ، كانی (سەلسەبیل) .

پ٦٠/ ئایا ئاگری دۆزەخ قسە دەكات ؟ نموونەیەك لەقسەكانی كامەیە ؟

و// بەڵێ قسە دەكات نموونە :﴿ هل من مزيد ) .

پ٦١/ ( جەهجاه ) كێ یە ؟

و// پیاوێكی هۆزی ( قحطان ) ە ، لەئاخر زەماندا دەبێتە پاشا و هەمووان گوێڕایەڵی دەكەن .

پ٦٢/ زانایان شەفاعەت دەكەن بەچەند بەشەوە ؟

و// شەفاعەت بۆ ١. پەلەكردن لەبڕینەوەی حیساب دا ٢. خستنە بەهەشتی هەندێك ئیماندار بێ لێپرسینەوە ٣ . بەرزكردنەوەی پلە لە بەهەشتدا ٤. كۆمەڵێك ئیماندار هەرچەندە شایستەی هەندێك سزا بن، خوا لێیان ببورێت ٥ . دەرهێنانی ئیمانداران لە دۆزەخ دا پێش سزادانی شایستەیان .

پ٦٣/ زاراوەی ( الشفاعة العظمى )مانای چی‌یە؟

و// شەفاعەتێكە بۆ پەلەكردن لە بڕینەوەی حیساب و ڕاگرتنی دروستكراوەكان لە ساحەی حەشر دا

پ٦٤/ كام ئایەت ئاماژە بۆ پردی (صراط) دەكات ، مەبەست لەمپردە چی‌یە ؟

و// پردێكەلە موو باریكتر و لە شمشێر تیژترە لە سەر پشتی دۆزەخە، هەركەس لێی نەپەڕێتەوە ناگاتە بەهەشت .. ئایەتی ﴿ وان منكم الا واردها...... ﴾ مریم / ٢٧

پ٦٥/ ناوی چوار ڕووباری بەهەشت بڵێ ؟

و// (سیحان ـ جیحان ـ فورات ـ نیل )

پ٦٦/ كام فەرموودەیە تیایدا هاتووە : گۆڕیان باخچەیە ، یان گۆڕیان چاڵی سزا ؟

و// ( القبر اما روضة من ریاض الجنة ، أو حفرة من حفر النار . رواه الترمزی

پ٦٧/ كام وتانەیە بەزار سووكن ، بەلام لای خوا زور خۆشەویستن و لەتەرازووی قیامەتیشدا قورسن ؟

و// ( سبحان الله وبحمده .. سبحان الله العظیم ) .

پ٦٨/ یەكەم كەس لەئومەتی محمد پێغەمبەر (ﷺ) دەچێتە ناو بەهەشت كێ یە ؟

و // حەزرەتی ئەبوبەكری صدیق (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٦٩/ ڕەنگی ئەندامەكانی دەست نوێژی ئیمانداران لە قیامەت دا چۆنە !

و// زۆر سپی و بریسكەدار و نورانین ، تا بەوەدا بناسرێنەوە كە نوێژكەری خواناس بووە .

پ٧٠/ كام ئایەت بەڵگەی ئاشكرایە كە ئیمانداران لەقیامەتدا خوای گەورە دەبینن ؟

و// ئایەتی ﴿ وجوه یومئذ ناضرة ، الی ربها ناظرة ﴾ القیامە /٢٣.

## خەرمانێك لە ------ ❁ ------ (١٠٠٠) پرسیار

پ١/ (الفتح الاكبر) چی بوو ، كەی ڕوویدا ؟

و// فەتحی مەككەی پیرۆز بوو ، لە مانگی ڕەمەزانی سالی (٨كۆچی

دا بوو .

پ٢/ یەكەم تیر هاوێژ لە مێژووی ئیسلام دا كێ بوو ؟

و// سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص (خوای لێ ڕازی بێت ) بوو.

پ٣// یەكەم سەفیر لەمێژووی ئیسلامی دا كێ بوو ؟

و// موصعەبی كوڕی عومەیر (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٤ یەكەم نوێژی هەینی ، كێ كردی و لەكوێ بوو ؟

و// پێغەمبەر (ﷺ) كردی ، لە (بەنی سالم ) لە مەدینە ی پیرۆز .

پ٥/ كام دوو ئەشكەوت لە مێژووی ئیسلامدا بەناوبانگن؟

و//ئەشكەوتی (حراء) و ئەشكەوتی (ثور)

پ٦/ سەرۆكی دوو ڕووەكانی شاری مدینە كێ بوو؟

و// عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی

پ٧ بانگەواز لەمەدینەدا چەند ڕۆژی خایاند ؟

و// سیانزدە سالی خایاند

پ٨/ كەی وەفدی (نجران ) هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ؟

و// لەسالی (نۆ)ی كۆچی دا.

پ٩/ ئەو جێگایەی لەوەختی فەتحی مككەدا ئەمین بوو ، كوێ بوو ؟

و// كەعبە ، مالی ئەبوسوفیان ، هەركەسە و مالی خۆی .

پ١٠/ كەی نوێژ بەم شێوەی ئێستا فەرز كرا ؟

## خەرمانێك لە ـــــ۞ـــــ (١٠٠٠) پرسیار

و// لەشەوی معراجی پیرۆزدا

پ١١/ کام پێغەمبەر بە ( باوکی پێغەمبەران ) ناسراوە ؟

و//ئیبراهیم پێغەمبەر ((سەلامی خوای لێ بێت ) )

پ١٢/ بانگدان بۆ نوێژ لەکوێ دەستی پێکرد ؟

و// لەشاری مەدینەی پیرۆزدا

پ١٣/ لەکەیەوە ( کەعبە) بوویە قیبلەی موسڵمانان ؟

و// پاش شەش مانگ لەهیجرەت بۆ مەدینە

پ١٤/ لەکەیەوە پێغەمبەر (ﷺ) نامەی نارد بۆ پاشایانی دەوروبەر؟

و// لەدوای صولحی (حودەیبیە ) .

پ١٥/ ئەونوێنەرە کوردەی کە خۆی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ ) و موسڵمان بوو ، کێ بوو ؟

و//(جاوان ) یاخود (کاوان )ی کوردی بوو (خوای لێ ڕازی بێت )

پ١٦/ کەی شەڕی (مؤتة) ڕوویدا؟

و// لەساڵی هەشتەمی کۆچی دا

پ١٧/ کێ ئاڵا هەڵگری ئوحود بوو ؟

و// موصعەبی کوڕی عومەیر (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ١٨/ دوا غەزا کە پێغەمبەر (ﷺ) تیایدا بەشدار بوو ، کوێ بوو؟

و// غەزای (تەبووك) بوو .

پ١٩/ پەیمانی حودەیبیە لەکوێ و کەی بەسترا ؟

و// لەساڵی شەشەمی کۆچی دا و ، لە سەر زەوی (حودەیبیە) نێوان شاری مککە و مەدینە

پ٢٠/ یەکەم ماڵی خوا کە لەسەر زەوی دروستکرابێت ، کامەیە ؟

و// مزگەوتی (الحرام) لە مککە ، واتە (کەعبەی پیرۆز) .

پ٢١/ جەنگە (خەیبەر) کەی ڕوویدا ؟

و// لەساڵی حەوتەمی کۆچی دا

پ٢٢/ جەنگی (خەندەق) بۆ وا ناونراوە و ، کەی ڕوویدا ؟

و// چوونکە موسڵمانان بەدەوری مەدینەدا خەندەقیان هەڵکەند ، لەساڵی (٥)ی کۆچی

پ٢٣/ حوکمی ئیسلامی لە ئەندەلوس ساڵی چەند کۆتایی پێهات ؟

و// لەساڵی (١٤٩٢)ز ، خاچ پەرستەکان ئەندەلووسیان داگیر کرد .

پ٢٤/ لەکام جەنگی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ)دا ، بەهۆی ئەخۆشی لەخۆبایی بوونەوە ، موسڵمانەکان شکان ؟

و// لەجەنگی حونەین دا ، ﴿ ويوم حنين اذ اعجبتكم كثرتكم﴾

پ٢٥/لەکام جەنگدا (صلاح الدینی ئەیوبی) خاچ پەرستەکانی شکاند ؟

و// لەجەنگی (حطین) دا کەلە گوندی (حطین) لە فەلەستین لەساڵی (١١٨٧)ز دا ڕوویدا .

پ٢٦/ یەکەم کەس و دوا کەس کەقودسی ڕزگار کردبێ کێ بوون ؟

و// ١ـ خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت) ، ٢ ـ صلاح الدینی ئەیوبی ، انشاءالله جارێکی تر بۆ هەتا هەتایی ڕزگار دەکرێتەوە .

پ٢٧/ كێ مێژووی كۆچی داهێنا ؟

و// حەزرەتی عومەری كوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٢٨/ كێ یەكەم كەس دراو (سكە)ی ئیسلامی لێداوە ؟

و// حەزرەتی عومەری كوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٢٩/ غەزای قادسیە بەفەرماندەیی كێ بوو ؟

و// (سەعدی كوڕی ئەبی وەققاس) (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٣٠/ دیوانی سەربازی (دیوان الجند) كەیی و كێ دایمەزراند ؟

و// حەزرەتی عومەری كوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێت) لەساڵی (٢٠)ی كۆچی دا بوو .

پ٣١/ كێ فەرماندە بوو لە ڕزگاركردنی میسردا ؟

و// عەمری كوڕی عاص (خوای لێ ڕازی بێت) .

پ٣٢/ كەوتنی ئاڵا لەكاتی شەڕدا مانای چی بوو ؟

و// نیشانەی شكانی ئەو لەشكرە بوو .

پ٣٣/ لەساڵی چەندا (نەهاوەند) ڕزگاركرا ؟

و// لەساڵی (١٩)ی كۆچی دا .

پ٣٤/ جەنگی نەهاوەند بەچی مەشهورە لەمێژوودا و ، بۆ ؟

و// بەجەنگی (فتح الفتوح) چونكە ڕیشەی دەوڵەتی ساسانیەكانی بەیەكجاری تیایدا دەرمات .

پ٣٥/ شاری بەسرە لەساڵی چەند و لەسەردەمی كێ دا دروستكرا ؟

و// لەساڵی (٦٣٦) ز و لەسەردەمی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب دروستکرا

پ٣٦/ خەلافەتی حەسەنی کوڕی عەلی چەندەی خایاند ؟

و// تەنها ماوەی شەش مانگ .

پ٣٧/ کێ شاری (فوسطاط)ی بنیاتنا لە وڵاتی میسردا ؟

و// عەمری کوڕی عاص (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣٨/ کەی و لەکوێ حەزرەتی حسێن شەهید کرا ؟

و// لەڕۆژی عاشورا ، ساڵی (٦٨٠)ز دا لە کەربەلا .

پ٣٩/ یەکەم کەس کە بیعەتی دا بەحەزرەتی حسێن کێ بوو؟

و// قەیسی کوڕی ساعدی ئەنصاری (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٤٠/ پایتەختی دەوڵەتی ئەمەویەکان کوێ بوو ؟

و// لەشام دا ( دیمەشق ) ، لەئەندەلوسیش ( قورتوبە) بوو .

پ٤١/ دیوانەکانی دەوڵەت لەسەردەمی ئەمەویەکاندا ، چی بوون ؟

و // دیوانی سەربازی ، خەراج و باج ، نامەکان .

پ٤٢/ کێ دەوڵەتی ئەمەوی دامەزراند ؟

و// معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان.

پ٤٣/ دەوڵەتی ئەمەوی بەناوی کێوە ناونرا ؟

و// بەناوی ( ئومەویەی کوڕی عبد الشمس ) ە وە ناونرا.

پ٤٤/ یەکەم خەلیفە کەحیمایە و پاسەوانی بۆخۆی دانا کێ بوو ؟

و// معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان .

پ٤٥/ کام کۆمەڵ خەلافەتی پشتا و پشت (وراثی) یان داهێنا؟

و// ئەمەوییەکان بوون.

پ٤٦/ پاشا ڕۆمییە هاوسەردەمەکانی حەزرەتی معاویە کێ بوو ؟

و// قوستەنتینی دووەم ، قوستەنتینی چوارەم .

پ٤٧/ (وەلیدی کوڕی عبد الملك ) چەند ساڵ خەلیفە بوو؟

و// نۆ ساڵ و هەشت مانگ .

پ٤٨/ کەی( حەجاجی کوڕی یوسفی ثە قەفی ) کۆچی دوایی کرد ؟

و// لەمانگی شەوال ساڵی (٩٥)ی کۆچی.

پ٤٩/ ( عومەری کوڕی عبد العەزیز ) چەند ساڵ خەلیفە بوو ؟

و// دوو ساڵ و پێنج مانگ و چواردە ڕۆژ .

پ٥٠/ (عەبدولەلیکی کوڕی مەروان) لە ساڵی چەند دا لەدایك بوو ؟

و// لەساڵی (٢٦) ی کۆچی دا .

پ٥١/ ئەماراتەکانی دەوڵەتی ئەمەوی کامانە بوون ؟

و// حیجاز . عێراق . دورگەی عەرەب . دەڵەری شام . میسر . سەرووی ئەفریقیا . ئەندەلوس .

پ٥٢/کێ فەتحی سەرزەمینی ئەندەلووسی کرد ؟

و// موسای کوڕی نصیر.

پ٥٣/ جەنگی (ذات العیون) بۆ وا ناونراوە ؟

و// چوونکە تیرهاوێژە موسڵمانەکان بەتیر چاوی هەزار لە بێ باوەڕیان لەشەڕدا کوێر کرد .

پ٥٤/ ڕەنگی ئاڵای ئەمەوی چۆن بوو ؟

و// سپی بوو

پ٥٥/ گەورەترین مزگەوت کە ئەمەویەکان دروستیان کرد ، کامیە ؟

و// مزگەوتی (ئەمەوی)یە ، لە (دیمەشق)

پ٥٦/ (عومەری کوڕی عبدولعەزیز ) لەپاش کێ بوو بە خەلیفە ؟

و// لە پاش خەلیفە (سولەیمانی کوڕی عەبدول مەلیك )

پ٥٧/ ئەمەویەکان چەند خەلیفە بوون ، لە شام و لەئەندەلووس دا

و// لەشامدا (١٣) ، لە ئەندەلووسیشدا (١٦) خەلیفە بوون .

پ٥٨/ کام پاشا ئەو کاغەزەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی نارد ، بەم شەرمانە دڕاندی ؟

و// کیسرای پاشای ساسانیەکان بوو

پ٥٩/ کام خەلیفە بە ( پێنجەمین ) خەلیفەی ڕاشیدین ناسراوە ؟

و// خەلیفە (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٦٠/ دوا خەلیفەی ئەمەوی لە ئەندەلووس دا کێ بوو ؟

و// خەلیفە (هاشمی سێیەم) بوو کە (المعتد بالله) ناسراوە .

پ٦١/ یەکەم جوگرافی ناسی موسڵمان کێ بوو ؟

و// (یەعقووبی ) بوو . کەلەکۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی‌دا ژیاوە .

پ٦٢/ کەی و لەکوێ ( هاروونە ڕەشید ) لەدایك بووە ؟

و// لەساڵی (١٤٥ك ) لە ( ڕەی ) نزیکی بەغداد لە دایك بووە

پ٦٣/ یەکەم خەلیفەی عەباسی کێ بوو ؟

و/ ئەبولعەباسی سەفاح بوو

پ٦٤/ دوا خەلیفەی عەباسی کێ

و/ خەلیفە (المعتصم بالله) بوو

پ٦٥/ خەلیفە مەئموون کوڕی کام خەلیفە بوو ؟

و/ کوڕی هارونە رەشید و برای خەلیفە (أمین) بوو.

پ٦٦/ هارون الرشید لەژیانیدا چەند حەجی کردووە ؟

و/ نۆ جار حەجی کردووە

پ٦٧/ کەی ئەبو جەعفەری مەنصور بوو بە خەلیفە ؟

و/ لەساڵی (٧٥٤) زدا

پ٦٨/ کەی و لەکوێ ئەبوجەعفەری منصور کۆچی دوای کرد ؟

و/ لەحەج دا، (١٥٨)ی کۆچی

پ٦٩/ گەورەترین و یەکەمین وەزیری خەلیفە هارون کێ بوو

و/ یەحیای بەرمەکی بوو

پ٧٠/ لەسەردەمی ( هارون الرشید) دا پاشای فەرەنسا کێ بوو ؟

و/ پاشا(شەرلمان ی کوڕی پاین) بوو.

پ٧١/ لەسەردەمی عەباسی دا، لەمیسردا چ دەوڵەتێك هەبوو ؟

و/ دەوڵەتی (مەمالیك)بوو.

پ٧٢/کەی دەوڵەتی (سلجوقی) هەڵوەشایەوە ؟

و/ لەساڵی (٤٩٠) ی کۆچی، بەدەستی خوارزم شا

پ٧٣/ کام خەلیفە و لەساڵی چەندا (شاری بەغداد) ی بونیات نا ؟

و// خەلیفە ئەبوجەعفەری مەنصور، لەساڵی ٧٦٢ی ز دا .

پ٧٤/ عەباسیەکان کەی دەوڵەتیان دامەزراند ؟

و// لەساڵی (١٣٢) ی کۆچی‌دا .

پ٧٥/ دەوڵەتی عوسمانی چەند ساڵ بەردەوام بوو ؟

و//( ٥٢٣) ساڵ بەردەوام بوو

پ٧٦/ دەوڵەتی عەباسی بەناوی کێوە ناونرا ؟

و// بەناوی (عەباسی کوڕی عەبدول موتەلیب ) (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٧٧/ کەی مەغۆلەکان شاری (بەغداد) یان داگیر کرد ؟

و// لەساڵی (٦٥٦)ی زایینی دا .

پ٧٨/ لەشکری ئیسلام کە ساسانیەکانی ڕووخاند ، بە فەرماندەیی کێ و ژمارەیان چەند بوو ؟

و// بە فەرماندەیی خالیدی کوڕی وەلید ، و ژمارەیان (١٨) هەزار کەس بوو .

پ٧٩/ کێ بەردە ڕەشەکەی کەعبەی پیرۆزی دزی و، کەی بوو ؟

و// (القرامطـة) دزیـیـان ، لەسـاڵی (لەسـاڵی(٩٢٠)ی ز دا ، (٢٢) سـاڵ شاردیانەوە .

پ٨٠/ کەی و کێ پایتەختی لەبەغداوە گواستەوە بە سامەڕا ؟

و// خەلیفە موعتەصەمی عەباسی ، لەساڵی (٨٣٦ز)دا .

پ٨١/ کێ مەدرەسەی (المستنصرية)ی بەغدادی دامەزراند ؟

و// خەلیفە (المستنصر بالله) ی عەبباسی

حەزمانێك لە ـــــ ـــ ـــ (١٠٠٠) پرسیار

پ٨٢/ ژمارەی خەلیفەی عەباسییەکان چەند بوو ؟

و// (٣٧) خەلیفە

پ٨٣/ کام کۆمەڵ فیتنەی (خلق القران) یان هێنایە کایەوە ؟

و// کۆمەڵی (موعتەزیلە).

پ٨٤/ کێ ( بیت الحکمة )ی دامەزراند ، ئیشی چی بوو ؟

و// خەلیفـە مـەئموون ، بـۆ وەرگـێڕانی بەرهـەمی زمانـەکانی تـر بـە تایبەتی یۆنانی

پ٨٥/ ژمارەی سوڵتانەکانی عوسمانیەکان چەند بوو ؟

و// (٣٧) سوڵتان بوو

پ٨٦/ کێ دەوڵەتی عوسمانی دامەزراند و ، کەی بوو؟

و// عوسمانی کوڕی ئەرطغرول ، لەساڵی (١٢٨١) ز دا .

پ٨٧/ کێ فەتحی قوستەنتینیەی کرد ، کەی بوو ؟

و// سوڵتان (محمدی فاتح ) لەساڵی (١٤٥٣)ز دا .

پ٨٨/ کێ و کەی دەوڵەتی (فاطمی) لەمیسر ڕووخاند؟

و// صلاح الدینی ئەیوبی . لەساڵی( ١١٧١ز) دا .

پ٨٩/ صلاح الدینی ئەیوبی ناوی چی‌یە و، لە کوێ لەدایك بووە ؟

و// ناوی(یوسفی کوڕی ئەیووب)ە ،وەلە (تکریت) لەدایك بووە .

پ٩٠/ کێ ڕێبازی نەقشبەندی دامەزراند لەکوردستان دا ؟

و// مەولانا خالیدی نەقشبەندی (خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٩١/ کێ و کەی ( الجماعة المسلمة )ی لە پاکستان دامەزراند ؟

و/ ئەبولئەعلای مەودوودی (خوای لێ ڕازی بێت)

پ٩٢/ ئەوکەڵە پیاوە لیبییەی کە ئیتالیەکان ئیعدامیان کرد کێ بوو؟

و/ (عومەر موختار بوو (خوای لێ ڕازی بێت).

پ٩٣/ کەی خەلافەتی ئیسلامی هەڵوەشێنرایەوە؟

و/ لەساڵی (١٩٢٤) ز دا.

پ٩٤/ کێ زانکۆی ئەزهەری لە میسر دامەزراند و کەی بوو؟

و/خەلیفە (المعز لدین الله) ی فاطمی لەساڵی (٩٧٢)ی زاینی.

پ٩٥/ کەی ئیمام (حسن بنا) شەهید کرا؟

و/ لە شوباتی ساڵی (١٩٤٩)ی ز دا

پ٩٦/ کەی شۆڕشگێڕی موسڵمانی کورد (شێخ سەعیدی پیران) لەدار درا

و/ (١٩٢٥)ز

پ٩٧/ ئەو مێژوو نووسە کوردەکێیە، کەکتێبی (وفیات الاعیان) ی داناوە؟

و/ ئیبن خەلەکان

پ٩٨/ مزگەوتی ئەیاصۆفیا کە کەنیسە بوو، کێ کردی بە مزگەوت.

و/ سوڵتان محمدی عوسمانی لە (ئەستنبوڵ) ە.

پ٩٩/ کێ کۆمەڵەی (العروة الوثقی)ی دامەزراند؟و/ جمال الدین الافغانی

پ١٠٠/ کێ بانگەشەی کرد بۆ دامەزراندنی زانکۆیەکی گەورە بەناوی (الزهراء) لە تورکیا؟

و/ بەدیع و زەمان (سەعیدی نورسی)

## خەرمانێك لە ـــــ۞ــــ (١٠٠٠) پرسیار

پ١/ئیمامی (شافعی) ناوی چی‌یە؟

و//ناوی (محمدی كوڕی ئیدریس)ە.

پ٢/ كام زانا دانەری كتێبی بەناوبانگی (التفسير الكبير)ە؟

و// ئیمام (فخر الدینی رازی)یە .

پ٣/ئیمام (مالیكی كوڕی انس) لەكام شاردا ژیانی بردوەتە سەر ؟

و// لەشاری مەدینەی پیرۆزدا و ، موفتی بووە لەمەدینەدا .

پ٤/ (ابن تیمیە) ناوی چی‌یە و لەكوێ لە دایك بووە ؟

و// ناوی (تقی الدین أحمد)ە و ، لە (حەرران)ی شام لەدایك بووە .

پ٥/ئیمامی بوخاری لە چەند سالی دا گەڕاوە بەشوێن فەرموودەدا ؟

و// لە (١٤) سالی دا و ، (١٦) سالی رەبەق بەردەوام بووە .

پ٦/ ئیمام (أحمد بن حنبل) لە (المسند)ەكەی دا چەند فەرموودەی كۆكردوەتەوە ؟

و // چل هەزار فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)

پ٧/ ئیمامی (شافعی) لەتەمەنی چەند سالی دا دەستی كردوە بە (فتوا) دان؟

و// لەتەمەنی (٢٠) سالی یەوە .

پ٨/ (مالك بن نبی) لەكوێ و كەی لەدایك بووە ؟

و//لەشاری (قوستەنتینیە) لە جەزائیر ، لەسالی (١٩٠٥)ز دا .

پ٩/ ئیمام (ابو حنیفە) چەند صەحابەی بینیوە ؟

و// تەنها چوار هاوەڵ (خوایان لێ ڕازی بێت) .

پ١٠/ وتەی ( مع المحبرة الی المقبرة ) هی کێ یە ؟

و// وتەی ئیمام (أحمد بن حنبل )ە .

پ١١/ (ابن الهیثم ) ی فیزیا زان لەکوێ و کەی لەدایك بووە ؟

و// لەشاری (بەصرە) ، لەساڵی (٩٦٥ز) دا

پ١٢/ ناوی دووان لەکتێبە گرنگە کانی ( ئیمامی شافعی ) چی یە؟

و// کتێبی ( الرسالة ) و کتێبی (الأم ).

پ١٣/ ئیمامی (موزنی ) فەرموویەتی چەند جار کتێبی (الرسالة )ی شافیعیم خوێندوەتەوە ؟

و// پێنج سەد جار ، هەموو جارێك سوودی تازەترم لێ بینیوە .

پ١٤/ (ابن خلكان ) ی مێژوونووس لەکوێ لەدایك بووە و ، لەکوێ خوێندوویەتی ؟

و// لەناوچەی (خەلەکان) ، نزیك شاری (هەولێر) ، لە حەلەب و دیمەشق و قاهیرە .

پ١٥/ گرنگترین داتراوی زانا (ابن الهیثم ) ی فیزیا زان کامەیە ؟

و// کتێبی (المناظرة ) ە .

پ١٦/ ئیمام (ابو حنیفة ) ناوی چی‌یە ؟

و// ناوی (نوعمانی کوڕی ثابت ) ە .

پ١٧/ ئەبولکەلام ئازادی هیندی ناوی چی‌یە و ، لەکوێ لەدایك بووە ؟

و ناوی (مولانا محی الدین احمد )ە ، لە شاری (مەککە).

پ١٨/ کتێبی ( الاصابة في تمییز الصحابة ) نووسراوی کێ یە ؟

و// دانراوی ( ابن حجر العسقلانی)یە .

پ١٩ / كێ گەورەترین فەرهەنگی لە زمانی عەرەبی دا نووسیوە ؟

و// (ابن منظور )نووسیویەتی ،كەكتێبی ( لسان العرب )ە .

پ٢٠ / ئیمامی (نەوەوی) ناوی چی‌یە ؟

و// ناوی (یەحیای كوڕی شەرف ) ە

پ٢١/ كێ فەرموویەتی : ( لولا الشافعي ماعرفنا فقه الحديث )؟

و// ئیمام (أحمد بن حنبل ).

پ٢٢/ئیمام (أبو حنیفه) چەند حەجی كردوە ؟

و// پەنجا و پێنج حەجی كردوە

پ٢٣/ ( ابن القيم الجوزي ) كەی‌ولەكوێ هاتووەتە دونیاوە ؟

و//سالی (٦٩١ك ) ، لەشاری (دیمەشق) .

پ٢٤/ كام ئیمام بە نازناوی (إمام الحرمين )مەشهوورە ؟

و// ئیمام (عبد الملیكی كوڕی عبدولای جوەینی ) .

پ٢٥/ بەناوبانگترین دانراوی (جەلالەدینی رۆمی ) كامەیە ؟

و//كتێبی (المثنوی ).

پ٢٦/ كێ بناغەی زانستی (أصول الحديث )ی داناوە ؟

و// (الشيخ مرتضى الأنصاري )بوو.

پ٢٧/ مێژوونامەی (البداية و النهاية ) دانراوی كام زانایە؟

و// دانراوی (ابن الكثير) ە .

پ٢٨/ (جلال الدینی رۆمی) ، لەكوێ نەسپەردە كراوە ؟

و// لەشاری (قونیە ) لە ولاتی تورکیا .

پ٢٩/ بەناوبانگترین قوتابی (جمال الدینی الافغانی ) کێ بووە ؟

و// (شێخ محمد عبده ( خوای لێ ڕازی بێت ) بووە.

پ٣٠/ ئیمامی (شافعی ) لەکوێ لەدایك بووە و ، گۆڕی لەکوێ یە ؟

و// (شاری غەززە ) ، لە (قاهیرة) نێژراوە .

پ٣١/ ئیمام غەزالی چەند ساڵ ژیاوە ؟

و// تەنها (٥٥) ساڵ ژیاوە ، لەنێوان (٤٥٠ تا ٥٠٥ ) ی کۆچی

پ٣٢/ کتێبی (الموطأ ) دانراوی کێ یە ؟

و// دانراوی ئیمام (مالك بن أنس )ە.

پ٣٣/کێ زانستی (العروض )ی لەبواری شیعری دا هێنا؟

و// (خلیلی فەراهیدی ) دایهێناوە .

پ٣٤/ ئەم شیعرە هی کێیە ؟ (فلما قسا قلبي و ضاقت مذاهبي

جعلت الرجا منك لعفوك سلما )

و// شیعری (ئیمامی شافعی ) یە.

پ٣٥/ کام ئیمام بە (٨٠ ) ساڵ تەمەنیەوە ، (١٣) خەلیفە گۆڕاوە کەچی

هیچیانی نەبینیوە

و// ئیمام (مالك بن انس ) ( خوای لێ ڕازی بێت ) .

پ٣٦/ کەی ئیمام حسن بنا شەهید کرا ؟

و// لەمانگی شوباتی ساڵی (١٩٤٩ز) .

پ٣٧/ کتێبی (الموافقات ) و ( الاعتصام) دانراوی کێن ؟

